# کتیب

# خەڵوەتگەی ڕۆحی منە

شکار عومەر

# به ناوی خودا


❁ ناوی کتێب: **کتێب خەڵوەتگەی ڕۆحی منە**

❁ بابەت: **گێڕانەوەی ئەدەبی**

❁ ناوی نووسەر: **شکار عومەر**

❁ دیزاینی بەرگ: **هیوا تاوگۆزی**

❁ پیت چنین: **توانا و هەوراز**

❁ هەڵەچن: **ڕێکان ڕەحیم**

❁ نۆبەتی چاپ: **یەکەم**

❁ساڵی چاپ: ٢٠١٤

❁ نرخ: **٣٠٠٠ دینار**

**لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی (١٥٨١)ی ساڵی (٢٠١٤)ی پێدراوە**




## ناوەڕۆك:

شەرمم دەکرد ... ئاخر شەو درەنگی کردبوو، جوان نەبوو بەو درەنگەی شەو لە دەرگا بدەم، بەڵام دەنگێك دەیوت (لە دەرگا بدە و شەرمی ناوێت!) نازانم بۆ لەم دێیەدا و لە ناو ئەم چەند ماڵەدا ئەم خانووە گڵێنە لە هەموو خانووە گڵێنەکانی تر زیاتر لە دڵی مندا جێی گرتووە؟!

بەڵام بەهەرحاڵ ئەو شەوە هەرچیم کرد نەمتوانی ئەو بێشەرمییە بکەم و لە دەرگا بدەم، تەنانەت ئەو دەنگەشی فەرمووی (لە دەرگا بدە و شەرمی ناوێت!) تەنها توانی دەستم ببات بەرەو دەرگاکە ئیدی نەیتوانی دەستم بدات بە دەرگاکەدا (لە دەرگام نەدا) بۆیە بە ناچاری بە ڕێگا خۆڵە باریکەکەی ناو دەشتەکەدا ڕۆیشتم تا گەیشتمە بەردەم شاخەکە دواتر کەمێك بە شاخەکەدا سەرکەوتم و خۆم گەیاندە ئەشکەوتەکە، واتە هەر بەو شەوە گەڕامەوە بۆ ئەو ئەشکەوتەی پێش نوێژی خەوتنان لێی دەرچووبووم، بەو مەبەستەی خۆم بگەیەنمە لادێکەی نزیك ئەشکەوتەکە. کاتێك گەیشتمە ناو ئەشکەوتەکە یەك پارچە ئارامی

و بێدەنگی و سکوتی ڕۆحی داگیری کردم، بەڵام ئەم ئارامیە نەیتوانی ببێتە دەوا بۆ نائارامیەکەی سکم، ئاخر برسێتی تەواو پەرێشانی کردبووم، ئەو کاتەیش لە ئەشکەوت دەرچووبووم بەرەو لادێکە زیاتر بە مەبەستی دەستخستنی بڕێك خۆراك ڕۆیشتبووم، بەڵام ئەو ڕۆیشتن و گەڕانەوە و دەستنەکەوتنی خۆراکە بە تەواوی برسی کردم و ئارامی لەبەر بڕیم، بەڵام هەرجۆرێك بێت بە چاوداخستنی بیٚ خەوتن ڕۆژم کردەوە.

بە دەرکەوتنی تیشکی خۆر ڕۆژ بوویەوە و منیش خۆم گەیاندە ئەو شوانەی بۆ لەوەڕاندنی ئاژەڵەکانی خۆی گەیاندبوویە ئەو نزیکانە، بەویستی خودا شوانەکە لە ڕۆژانی پێشوو بڕێك زیاتر خۆراکی پێبوو، بیٚ ئەوەی ڕاستیەکەی پێبڵێم کە من کێم، بۆ کاتی نانخواردن و کەمێك دوای خواردنەکەش بوومە هاوڕیٚ و دۆستی، بەڵام ئەو دەمەی نیازم بوو شوانە دڵپاك و بیٚ خەوشەکە جێبهێڵم، شوانەکە وتی:

من شتێك دەزانم.

منیش وتم: ئەو شتە چییە؟

وتی: ئەو شتەی من دەیزانم، تۆش دەیزانیت!

منیش لەگەڵ بەرزکردنەوەی برۆکانم وتم:

ئەو شتە چییە تۆ دەیزانیت و پێشتوایە منیش دەیزانم؟

وتی: پێموانییە تۆش دەیزانیت، بەڵکو دڵنیام دەیزانیت.

منیش لە لایەکەوە بیرم سەرقاڵی ئەوە بوو دەبێت ئەو شتە چی

بێت؟ لە لایەکی دیکەشەوە بە خۆمم دەوت باشە کەی ئەم قسانە قسەی شوانێکە!

دواتر زۆر بەبێ ئارامی پێموت:

ئەو شتەی تۆ دەیزانیت و لەوەش دڵنیایت کە من دەیزانم چییە؟

شوانەکە وتی: بە مەرجێك پێت دەڵێم.

وتم: چ مەرجێك؟

وتی: بەو مەرجەی ((لەگەڵمدا ڕاستگۆ بیت)).

وتم: هەرچەندە باجی ڕاستگۆیم چەند جارێك داوە، بەڵام لەگەڵ تۆش ڕاستگۆ دەبم.

وتی: دەی کە وایە زۆر باشە، منیش ئەو شتەت پێدەڵێم.

وتم: دەی بیڵێ، کوڕە خۆ من دڵم شەقی برد.

شوانەکە دەمی کردەوە قسە بکات، لەو کاتەدا سەگەکە وەڕی "وەو وەو وەو" هەر بۆیە شوانەکە زۆر بەپەلە هەستایەوە سەرپێ، کەمێك لە سەگەکە و ئاژەڵەکان خۆی نزیك کردەوە و نەختێك چاوی بەو ناوەدا گێڕا، بەڵام کە دڵنیابوو شتێکی ئەوتۆ نییە هاتەوە بۆ لای من و لام دانیشتەوە و وتی:

خۆ بیرت ماوە بڕیارتدا ڕاستگۆ بیت؟

وتم: بەڵێ بیرمە.

وتی: کاکە گیان ئەو شتەی من دەیزانم و تۆش دەیزانیت، ئەوەیە تۆ حاڵی ڕاستی خۆت بە من نەوت.

منیش سەرم داخست و بەدەم هەناسەدانەوە ئاهێکی سوکم هەڵکێشا.

شوانەکە وتی: وایە یان نا؟

منیش لە دڵی خۆمدا وتم (چش لەو باجەی ئەمجارەش بەهۆی ڕاستگۆبوونمەوە دەیدەم) بۆیە سەرم هەڵبڕی و وتم: وایە زۆر ڕاستە.

شوانەکە وتی: بەڕاستی ئافەرین کە بەڵێنەکەت نەشکاند و ڕاستگۆ بوویت، ئیتر باقی مەسەلەکە پەیوەندی بە مەرج و شتی واوە نییە، بەڵکو خۆت ئازادی لەوەی ڕاستی حاڵی خۆت دەگێڕیتەوە بۆم یان نا.

منیش بەتەواوی تووشی سەرسوڕمان بووم، بەشێکی سەرسوڕمانەکەم هی ئەوە بوو کە بە خۆمم دەوت ئەگەر بێتوو ئەم شوانە لە ڕاستی حاڵی من ئاگادار بێت، دەبێت چی ڕوو بدات؟! بەڵام بەشەکەی تری لەوەوە بوو کە بە خۆمم دەوت (ئەرێ شوانێك چۆن ئەم شتانە دەزانێت؟!) چۆن دەتوانێت وەها ناخی مرۆڤێك بخوێنێتەوە؟! چۆن وەها هونەرێك دەزانێت کە بۆ وتنی شتێك مەرجی هەیە؟! ئەمانەم زۆر لا سەیر بوو، بەڵام دواجار بڕیارمدا لێی بپرسم (تۆ چۆن ئەم شتانە دەزانیت) بۆیە ڕاستەوخۆ بڕیارەکەم جێبەجێکرد و لێم پرسی:

کاکی شوان تۆ چۆن ئەوەت زانی کە من ڕاستی حاڵی خۆمم بۆ باس نەکردوویت؟

وتی: من لە منداڵیدا نزیکەی دوو ساڵ شوانیم کردووە، بەڵام لە دوای ئەو دوو ساڵە ئیدی براکەم هاتە جێی من و بوو بە شوانی حەیوانەکانی ناو ئاوایی.

منیش وتم: دەی ئەمە کەی دەبێتە وەڵام بۆ پرسیارەکەی من؟

وتی: خۆ من نەموتووە ئەمە وەڵامی پرسیارەکەی تۆیە، ئەوە تۆی ئەوەندەت پەلەیە ئەم قسانەی من ناو دەنێیت وەڵام.

وتم: دەی باشە ئیدی هەوڵ دەدەم پەلە نەکەم.

وتی: زۆر باشە، ئەوەم بۆ باس کردیت براکەم شوانی ئەم حەیوانانەیە، بەڵام لەبەرئەوەی ئەمڕۆ کارێکی بۆ پێشهات لە بری خۆی منی ڕاسپارد حەیوانەکان بێنمە ئەم دۆڵ و کێوە، بۆیە نانەکەشم ئەوەندە زۆر بوو بەشی هەردووکمانی کرد (چونکە ماوەیەکی زۆرە بە شوانی نەهاتوومەتە ئەم دۆڵ و کێوە تابزانم چەندێك نان و خۆراك بەشی ڕۆژێکی شوانێك دەکات).

منیش وتم: ئەی تۆ چ کارەیت؟

وتی: بڕیار بوو پەلەنەکەیت.

بزەیەکی شەرمنانەم کردوو هیچم نەوت یان ڕاستتر بڵێم هیچم بۆ نەوترا، بەڵام بۆ جارێکی تر وەڕینی سەگەکە هەردووکمانی ڕاچڵەکاند بۆیە شوانەکە بەپەلە هەستایەوە و چوو بۆ لای سەگەکە و ئاژەڵەکان کە زیاتر لە ئێمە دوور کەوتبوونەوە، بۆیە لەم کاتەدا کە بۆ خۆم بە تەنیا مامەوە جارێکی تر ئەوە هاتەوە بە خەیاڵمدا ئەگەر ئەم شوانە بە حاڵی ڕاستەقینەی من

بزانێت چی ڕوودەدات؟ حاڵی خۆمی بۆ باس بکەم یاخود نا؟ ئیدی چەندین پرسیاری لەم جۆرە لە خەیاڵمدا هاتووچۆیان دەکرد، بەتەواوی ئەم خەیاڵانە بووبوونە واقعی من، بەڵێ "ئەو خەیاڵانەی دروستبوونیان لە دەست تۆدا نییە ئیدی مانەوەت لە شوێنی خۆت لە دەستی تۆ دەردەکەن".

لەم خەیاڵانەدا بووم شوانەکە لە تەنیشتمەوە وەستابوو دەیوت: چییە دەڵێی ئاگات لێرە نییە؟

منیش پەشۆکام و سەرم بەرز کردەوە، جا کە شوانەکە بەو پەشۆکاویە منی بینی وتی: دەتەوێت شتێك بڵێیت؟

منیش نەمدەزانی چی بڵێم، بۆیە شوانەکە وتی: ئەگەر دەتەوێت شتێك بڵێیت من گوێت بۆ دەگرم، ئیدی ئەم جۆرە هاندان و قسەکردنەی ئەو منی هێنایە گۆو وتم:

ڕاستییەکەی من لە دوێنێ پێش نیوەڕۆوە بە نییەتی بیرکردنەوە هاتوومەتە ئەم شاخە و شەوی ڕابردووش لەو ئەشکەوتە مامەوە.

شوانەکە وتی: بیرکردنەوە لە چی؟

وتم: بۆ خۆیشم نازانم بیرکردنەوە لە چی.

وتی: ئەوە کەی قسەیە "خۆیشت نازانیت بیر لە چی دەکەیتەوە".

وتم: دەزانم کە بیر لە چەند شتێك دەکەمەوە، بەڵام نازانم ئەو شتانە چین؟ نازانم ئەو شتانە ناویان چییە؟ تەنانەت هەندێکجار بە

خۆم دەڵێم نەك من، كەسی تریش ناوی ئەو شتانە نازانێت.

شوانەكە وتی: ڕاستە كە من بڕیارمدا گوێت بۆ بگرم، بەڵام باوەڕ بكە زۆر چاك لەم قسانەی تۆ حاڵی نابم.

منیش وتم: دەی زۆر باشە تۆ خەریكی كاری خۆتبە منیش دەچم خەریكی ئەو كارە دەبم كە بۆی هاتوومەتە ئەم شوێنە، بەڵام با ئەوەت پێ بڵێم من دوێنێ كاتێك هاتم بۆ ئەم شوێنە بەو نییەتە هاتم تا ئێوارە لێرە بم و دواتر بگەڕێمەوە بۆیە خواردنێكی ئەوتۆم لەگەڵ خۆم نەهێناوەو بیركردنەوەش ڕێگەی پێ نەدام بگەڕێمەوە، ئەگەر بكرێت ئەو برە خواردنەی بۆ خۆتت هێناوە بەشی منیشی لێ بدەیت.

شوانەكە زۆر بە بێ منەتی و خۆشحاڵییەوە زۆربەی نانەكەی دا بە من و تەنها كەمێكی بۆ خۆی هێشتەوە كە چەند پارووییەك دەبوو لەگەڵیشیدا چەند دانەیەك تەماتەی دایە دەستم.

ئیدی بە خوداحافیزیكردن لە یەكدی جیابووینەوە و من بەرەو ئەشكەوتەكە ئەویش بەرەو كارەكەی خۆی بەڕێكەوتین، من بە ماندوویی و شەكەتی خۆم گەیاندە ئەشكەوتەكە، بەڵام چاوەكانم بە تەواوی وێڵ و عەوداڵ و تامەزرۆی نوقاندن بوون، خەو تەواو زۆری بۆ هێنابووم بۆیە بە خۆمم وت با ڕاكشێم و سەرخەوێك بشكێنم، بەڵام كامە سەرخەوشكاندن، كاتێك چاوەكانم كردەوە دەبینم وا نزیكی ئێوارەیە بۆیە خۆم گەیاندە كانیاوەكە دەستنوێژێكم هەڵگرت و نوێژی نیوەڕۆم بە قەزا و عەسریشم بە

حازری کرد، دواتر گەڕامەوە بۆ ئەشکەوتەکە، دوای نوێژی ئێوارەش نیوەی نانەکەم بە تەماتەوە خوارد، دواتریش نوێژی خەوتنانم ئەنجامدا و ئیدی بە جۆرێك لە نائارامیدا دانیشتم ئەم نائارامیە زیاتر بۆ پەرش و بڵاوی بیرکردنەوەکانم دەگەڕایەوە، کاتێك دەستم دەکرد بە بیرکردنەوە لە شتێك تەنها چەند خولەکێکی کەم دەمتوانی بیر لەو شتە بکەمەوە وردە وردە لە بیرکردنەوە لەو شتە لامدەدا و شتێکی تر بیری منی بە خۆیەوە سەرقاڵ دەکرد، دەستم کرد بە بیرکردنەوە لە ژیان و کاری مرۆڤەکان، لە ناکاو سام و هەیبەتی گەورەیی شەو وەستاندمی و بە بیرکردنەوە لە خۆی "شەو" سەرقاڵی کردم، بەڵام هیچ بیرکردنەوەیەك ئەوەندەی بیرکردنەوە لە شەو زۆری نەخایاند، بیرکردنەوە لە شەو چەند پەیامێکیان دەدا بە گوێی مندا و دەیوت ڕۆژ بەناوی ڕووناکییەوە پەردەی بەسەر دروستکراوەکاندا داوە، هەرچەندە گەورەترین شانازی بۆ ڕۆژ ڕووناکیەکەیەتی، بەڵام دیسانەوە ناتوانین لە ڕۆژدا مەخلووقەکان وەك خۆیان ببینین، گەرچی شەو ڕووناکی نییە تا شانازی پێوە بکات، بەڵام نوورێکی هەیە هیچ پەردە و حیجابێك ناتوانێت ببێتە بەربەست لە نێوان چاوەکانی تۆ و خالقدا، هەستم دەکرد شەو لە لاپەڕەی کتێبی نووسەرە ڕۆحانییەکان دەچێت تا نەیخوێنیتەوە نازانیت چییە، هەندێکجار ئەو لاپەڕانە دەیشیانخوێنیتەوە دیسان نازانیت چین و باس لە چی دەکەن، تا ڕۆژێك بە هۆکارێك بۆت دەردەکەوێت ئەو

شتانەی ئەو نووسیونی تا (ئەزموون)ی نەکەیت نازانیت چییە.

شەو لە باوەشی دایکم دەچوو، ئاخر هەر وەختێك چووبێتمە باوەشی دایکمەوە منداڵ بوومەتەوە و هەموو هەستەکانی گەورەبوونم باریانکردووە و تەواو ساوا بوومەتەوە تەنانەت زۆرجار منداڵبوونەوەم ئەوەندە گەورە بووە بە دایکم وتووە چیرۆکێکم بۆ بگێڕەوە، جا شەویش بە تەواوی ئاوەهایە تاکو بچیتە باوەشی بچووك دەبیتەوە ئەوەندە بچووك دەبیتەوە پێتخۆشە چیرۆکی نزا بخوێنیتەوە، تەنها شتێك ئەوەندەی چوونەباوەشی شەو سامی هەبێت چوونەباوەشی مزگەوتی ناو لادێیەکە، میحرابی مزگەوتەکانی لادێ ئەوەندە سامی هەیە مەگەر ئیمان غیرەتی ئەوەت بداتێ بچیتە ناویەوە. شەو بۆ مرۆڤ وەکو ئاو وایە بۆ درەخت، بیرکردنەوەم لە شەو بە منی دەوت ئەگەر دەتەوێت فرسەتێکی گەورەی وەکو شەو ببێتە میوانت بڕۆ ببەرە میوانی سبەی شەو، ئیدی بەمجۆرە سەرقاڵ بووم بە بیرکردنەوە تاکو ئەوەی لەناکاو شنەبایەك ڕایچڵەکاندم و لە بیرکردنەوە دایبڕیم تا درەنگانێك زۆریَ بیرکردنەوە سەری قاڵ کردم تا ئەوەی بە تەواوی ماندوو بووم و وەستام، بە خۆمم وت کە بەیانی چی بکەم؟

وتم: هەر دەبێت بگەڕێمەوە ماڵەوە چونکە بەو نیازە هاتم بەیانی تا ئێوارە لەم ئەشکەوتە بمێنمەوە، بەڵام وا دوو شەوە لێرە ماومەتەوە. زۆر باشە بەیانی هەڵدەستم ئەگەر تەماتە و نانەکە

کەڵکیان مابوو دەیخۆم و دەگەڕێمەوە بۆماڵەوە.

ئیدی ڕاکشام تا خەوم لێکەوت، بەڵام دیسانەوە بیرکردنەوە سەریان قاڵ کردم تا ئەوەی خۆشم نازانم کەی خەوم لێکەوتبوو.

کاکی برا... کاکی برا... چاوم کردەوە دەبینم وا کوڕێکی گەنج دەستم لێدەدات و دەڵێت کاکی برا، زیاتر چاوم هەڵهێنا بینیم وا ڕۆژ بووەتەوە و خۆر بە تەواوی هەڵهاتووە، وتم فەرموو براگیان چیت دەویست؟

وتی: وەڵا کاکەم شەو درەنگ هات بۆ ماڵمان منی خەبەر کردەوە و پێی وتم (بەیانی کەمێك زووتر حەیوانەکان دەرکە و بیانبە بۆ شاخەکە هەر کە گەیشتیتە ئەوێش بە خێرایی خۆت بگەیەنەرە ئەشکەوتەکە، ئەگەر کوڕێکی لێبوو پێی بڵێ بێت بۆ ئاوایی و لە ئاوایی بڵێ من بۆ لای کاك دانا هاتووم.

منشی وتم: کاك دانا کێیە؟

ئەویش وتی: کاك دانا کاکەمە.

هەرچەندە ئەم کوڕە بە قسەکردنی و هەڵسوکەوتیدا دیار بوو کە تەواو نییە، بەڵام لێی تێدەگەشتم.

منیش وتم: براگیان من کاکەی تۆ ناناسم.

لەم کاتەدا دەنگی وەڕینی سەگێك هات، کە لام کردەوە بە لای دەنگەکەدا بینیم سەگەکەی دوێنێیە ئیتر لە مەسەلەکە تێگەیشتم.

کوڕەکەش وتی: چۆن کاکەم ناناسیت؟ دوێنێ ئەو حەیوانەکانی هێنابوو بۆ ئێرە.

ئیتر منیش بە ڕەچاوکردنی حاڵ و وەزعی ئەو کوڕە وتم: زۆر باشە تۆ بڕۆ خەریکی کاری خۆتبە تۆزێکی تر منیش دەچم بۆ ئاوایی بۆ لای کاکە دانات، کاکەی شوان چەند هەنگاوێك لە من دوور کەوتەوە، بەڵام من بانگم کردەوە و پێم وت: کاکە دانات هیچی تری نەوت؟

ئەویش وتی: بەرەوەڵا وتی بێت بۆ ئاوایی بڵێ بۆ لای کاك دانا هاتووم.

منیش پێکەنینێك گرتمی و دانیشتمەوە، بەڵام کامە دانیشتن، دانیشتن بۆ کردنی چەندەها پرسیار لە خۆم "باشە دەبێت چ ئیشێکی بە من هەبێت؟! ئەگەر ئەو ئیشی بە من هەیە بۆ نەهاتووە بۆ لام؟ بۆچی بچم؟ ئەگەر بچم چی ڕوو دەدات؟!" چەندین پرسیار و دڵەڕاوکێی لەم جۆرە، بەڵام دواجار بڕیارمدا بچم بۆ ناوئاوایی، کە هەستامەوە نان و تەماتەکە کەوتە بەرچاوم، بەڵام وازم لێهێنا و نەمخوارد، بەرەو کانییەکە بەڕێکەوتم لەوێ ئاوێکم کرد بە دەموچاومدا و دەستێکی تەڕم هێنا بە جل و بەرگەکانمدا و بەرەو ئاواییەکە ڕۆیشتم، بەڵام تا ناوئاوایی چەندین پرسیار و گومان دەهاتن بە مێشکمدا.

کاتێك گەیشتمە ئاوایی لە دوورەوە دوو ئافرەتم بینی وتم زۆر باشە لێیان نزیك دەبمەوە و پرسیاری ماڵی کاك دانایان لێدەکەم، بەڵام تا زیاتر لێیان نزیك دەبوومەوە شەرمم زیاتر دەبوو بۆیە بە هۆی شەرمەوە بێئەوەی پرسیاریان لێبکەم من بەلای

ئەواندا بەرەو سەرەوە ئەوانیش بەلای مندا بەرەو خوارەوە تێپەڕین، چەند هەنگاوێکی تر ڕۆیشتم خۆم بینییەوە لەبەردەم ئەو خانووە گڵینەی کە دوو شەو پێشتر کاتێك هاتمە ناو ئاواییەکە لە هەموو خانووەکانی تر زیاتر لە دڵمدا جێی گرتبوو ئێستاش هەمان هەست و کەیف و خۆشی و عەشقم بەرامبەر ئەم خانووە هەیە، بەڵام ئێستا نەك دەنگێك، بەڵکو هەموو وجودم هاوار دەکات بڕۆ پێشەوە و بدە لە دەرگای ئەم ماڵە، زۆر بە غیرەتەوە و بەبێ شەرمکردن "جا نازانم ئەم بێشەرمی و غیرەتە لە نەزانییەوە بوو یان ئەدەبی عیشقی من بوو بۆ ئەم خانووە" چوومە پێشەوە و لە دەرگام دا، دوای دووجار لە دەرگادان ئافرەتێك هات دەرگاکەی کردەوەو وتی: فەرموو کاکە گیان!

منیش وتم: زەحمەت نەبێت ماڵی کاك دانا لە کوێیە؟

ئافرەتەکەش وتی: کاکە گیان کەمێك چاوەڕێ بکە... چەند هەنگاوێك ڕۆشتەوە بەرەو ناوماڵەکە و یەك دوو جار بانگی کرد ماموٚستا... ماموٚستا... لە وەڵامی ئەم بانگ کردنەی ئافرەتەکە، دەنگی پیاوێکیش کە لە ناو ژوورەکانی خانووەکەدا بوو زۆر بە لاوازی هاتە گوێی من (ئاخر دەرگای حەوشە و ژووری خانووەکان لە لادێ زۆر لە یەکەوە دوورن کە ئەمە وایکردووە حەوشەکانیان گەورە بێت) دەیوت بەڵێ گیانەکەم چیت دەوێت؟ ئافرەتەکەش هەر بەدەم ڕۆیشتنەوە بەرەو لای پیاوەکە دەیوت ماموٚستا هەستە وەرە، ئیدی ئافرەتەکە و پیاوەکە بەیەك گەیشتن.

پیاوەکە وتی: ها ئافرەت چییە؟

ئافرەتەکەش بە دەنگێکی زۆر نزمەوە وتی: ئەو کوڕە هاتووە.

پیاوەکەش زۆر بە خێرایی و کەمێك دەنگ بەرزکردنەوەوە وتی: کامە، ئەوەی کاك دانا وتی؟

ئافرەتەکەش وتی: بەڵێ ... بەڵێ ... کوڕی ئەشکەوتەکە.

منیش کە لەبەردەرگای حەوشەکە وەستا بووم و گوێم لەم قسانە بوو زۆر بە لامەوە سەیر بوو، بەڵام فریانەکەوتم بیر لە هیچ بکەمەوە پیاوەکە (ئەوەی کە ئافرەتەکە پێی دەوت ماموٚستا) بە خێرایی خۆی گەیاندە لای دەرگای حەوشەو بە منی وت: فەرموو فەرموو کاکە گیان.

منیش وتم: سوپاس ماموٚستا گیان، وەڵا من هاتووم بۆ لای کاك دانا و ماڵیشیان نازانم، بە ئەرك نەبێت ماڵەکەیان کامەیە؟

ماموٚستاش وتی: جارێ فەرموو وەرنە ژوورەوە دوایش ماڵی کاك دانات پێ نیشان دەدەم.

ئیدی هەر چۆنێك بێت بەو خوڵکە پڕ لە ئەدەبەی ماموٚستا چوومە ژوورەوەو لەگەڵ ماموٚستا بەدەم ئەحواڵ پرسینەوە گەیشتینە هەیوانەکە و لەسەر داوای ماموٚستا هەر لەوێ دانیشتین، دوای کەمێك دانیشتن ماموٚستا وتی: دەنگوباسی ئەشکەوت؟ ئەمشەو لەوێ بوویت؟ چۆنت گوزەراند؟

منیش دەمم کردەوە قسە بکەم، ئافرەتەکە، کە وادیار بوو خێزانی ماموٚستا بوو، سینییەك و دوو پەرداخ ئاوی بەدەستەوە

بوو هاتە لامان و وتی: فەرموو ئاو بخۆنەوە.

من پەرداخێك ئاوم هەڵگرت و خواردمەوە مامۆستاش پەرداخەکەی دیکە، دوای خواردنەوەی ئاوەکە وتم: دەستخۆش بە راستی تینووم بوو، بەڵام تەواو هی تر نەهێنیت تینوێتیم شکا و ناتوانم ئاوی تر بخۆمەوە ئیدی ئەوە بوو خێزانی مامۆستا جێی هێشتین.

رووم کردە مامۆستا و وتم:

تۆ چۆن ئەمە دەزانیت کە من لە ئەشکەوت بووم؟

مامۆستا وتی:

جا ئەوە چییە! تەنانەت ئەوەش دەزانم لە دوێنێوە ئەوەی خواردووتە (نان و تەماتەو ئاوی کانی نزیك ئەشکەوتەکە) بووە.

منیش وتم:

وەڵا راست دەکەیت، بەڵام ئەوەت نەوت کە چەند دانەیەك لە تووە رەشەکەی نزیك کانییەکەشم خوارد، بەس توخودا مامۆستا کێ ئەمانەی پێ وتیت؟

مامۆستاش بۆئەوەی زیاتر قسەم لەگەڵ بکات وتی:

جارێ واز لەوە بێنە، کاکە گیان تۆ ناوت چییە؟

منیش وتم:

شەهرامی خزمەتکارت.

مامۆستاش وتی:

استغفرالله... بە راستی ناوەکەت زۆر خۆشە کاکە شەهرام.

منیش وتم:

سوپاس ماموستا گیان، بەلام چۆنت زانی من لە ئەشکەوتەکە بووم؟

وتی:

شەهرام گیان شەوی ڕابردوو کاتێك بۆ نوێژی خەوتنان چوومە مزگەوت پاش تەواوبوونی نوێژ و چۆڵبوونی مزگەوت کاك دانا هاتە لامەوەو مەرحەبایی یەکمان کردو وتی ماموستا گیان چەند شەوێکە نیازمە بێمە لاتان بۆ ماڵەوە و سەردانتان بکەم، بەلام لەسەر ویستی خودا ئەمشەو بۆم گونجاوە، بۆیە دێم بۆ ماڵتان لەوێ شتێکی تایبەت و گرنگیشت بۆ باس دەکەم.

منیش پێم وت:

لە خزمەتتدام بەخێربێیت سەرچاومان خۆشحاڵمان دەکەیت.

ئەوەبوو هەردووکمان (من و کاك دانا) لە مزگەوتەوە بەرەو ماڵ بەڕێکەوتین کە ئەمە مزگەوتەکەیە لە تەنیشتمان، گەیشتینە ماڵەوە دوای کۆمەڵێك قسە و باس و هەواڵپرسین و چا خواردن ئەوەبوو کاك دانا وتی:

ماموستا گیان ئەمڕۆ من لە جیاتی حەمەی برام حەیوانەکانم برد بۆ ئەو دۆڵ و کێوە، بەلام لەوێ کوڕێك هاتە لام وا دەردەکەوت زۆری برسی بێت بۆیە بۆ نانخواردن هاوڕێم بوو، دوای ئەوەی کۆمەڵێك قسە و باسمان پێکەوە کرد ئەو کوڕە ئەوەی وت کە بۆ (بیرکردنەوە هاتووەتە ئەم شاخ و ئەشکەوتە) کە لێم پرسی بۆ

بیرکردنەوە لە چی؟ لە وەلامدا کۆمەڵێك قسەی کرد، بەلام من زۆر بە باشی لەو قسانەی حاڵی نەبووم، بۆیە ئیدی دوای ئەو قسانە بڕێك نان و تەماتەی لە من وەرگرت و بینیم گەڕایەوە بۆ ئەشکەوتەکە.

منیش وتم:

ئیّ کاك دانا چی تر؟

کاك دانا وتی:

مامۆستا گیان تەواو هەر ئەوەندە.

وتم:

خۆزگە لەگەڵ خۆت بتهێنایە بۆ ئاوایی تا بە باشی لە مەسەلەکە حاڵی بووینایە.

کاك دانا وتی:

مامۆستا گیان لە ڕاستیدا من شتێکی وام بە بیردا نەهات، بەلام ئەگەر دەڵێیت با ئێستا کە ڕۆشتمەوە بە حەمە شوانی برام دەڵێم بەیانی کە حەیوانەکانی برد بۆ لەوەڕاندن سەرێك بدات لە ئەشکەوتەکە ئەگەر ئەو کوڕەی لیّ مابوو بینێرێت بۆ ئاوایی، پێت چۆنە؟

منیش وتم:

کاك دانا ئەگەر بتوانی ئەو ئەرکە بکێشیت خێرت دەگاتیّ.

ئیدی شەو کە کاك دانا ڕۆشت و جێیهێشتین من و خێزانم بە یەکترمان دەوت خودا بکات ئەو کوڕە لە ئەشکەوتەکە مابێتەوە و

دواتر بە دیداری شاد بین، ئەوەتا خوای گەورە دڵی من و خێزانەکەمی نەشکاند و بە دیداری شەهرام گیانی شاد کردین.

منیش وتم:

مامۆستا گیان کەواتە ئەو کاکەیەی کە دوێنێ فریام کەوت و نان و تەماتەکەی پێدام ناوی کاك دانایە وە ئەویش تۆی لە حاڵی من ئاگادار کردووە؟

مامۆستاش وتی:

بەڵێ شەهرام گیان.

منیش وتم:

یەعنی ئەگەر ماڵی کاك داناشم بدۆزیایەتەوە، بۆ ئەوە بوو بمهێنێت بۆ لای تۆ؟

مامۆستاش وتی:

بەڵێ کاکە شەهرام.

منیش وتم:

دەی باشە مامۆستا گیان ئێستە بێ ئەوەی کاك داناش ببینمەوە خۆم هاتمە بەردەمت، بۆچی ویستت من ببینیت؟

مامۆستا وتی:

شەهرام گیان، ئەوەی کە بۆچی من ویستوومە تۆ ببینم، وەڵامەکەی وا سادەو ئاسان نییە، ئەسڵەن لەوانەیە زمان نەتوانێت وەڵامی ئەم پرسیارە بداتەوە، بەڵکو پێویستی بەوەیە بە تێپەڕبوونی کات ئەم یەکتر بینینە ئەزموون بکرێت تا ئەو

وەڵامەمان دەست بکەوێت کە بۆچی من و تۆ یەك ببینین، "بەڵێ، تاکو ئێستاش زۆربەی قوتابییەکان ئەوە نازانن کە بۆچی دەبێت زوو زوو ماموستاکەیان ببینن، بەڵام بە تێپەڕینی کات ئەوە ئەزموون دەکەن کە ئەم یەکتر بینینە چی بەوان دەبەخشێت" بۆیە هەناسەکەم شەهرام گیان تۆش جارێ واز لە وەڵامی ئەو پرسیارە بێنە و وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەرەوە کە ئێستە من لێت دەکەم.

منیش وتم:

فەرموو ماموستا گیان.

ماموستا پرسی:

خۆشت ئەوە دەزانیت کە کاك دانا بە منی وتووە تۆ بۆ بیرکردنەوە هاتوویت بۆ ئەو ئەشکەوتە، بەڵام ئەو شتە چییە وای لە تۆیەکی گەنج و لاو کردووە تا ئەوەندە بە تامەزرۆییەوە بیری لێ بکەیتەوە؟ تەنانەت تامەزرۆییەکەت تا ئەو ڕادەیەی هەڵیگرتوویت و هێناوتی بۆ ئەم ئەشکەوتە.

منیش وتم:

ماموستا گیان تۆ مەڵێ ئەو شتە، بەڵکو بڵێ ئەو شتانە چین وایان لێت کردووە بیریان لێ بکەیتەوە.

ماموستا وتی:

دەی باشە شەهرام گیان ئەو شتانە چین؟

منیش وتم:

ماموستا گیان من بە بەردەوامی بیرم نەکردووەتەوە، بەڵام چەند

شتێك هەن هەروەختێك دەكەونە بەرچاوەكانی بیركردنەوەم ئیدی ناتوانم هەروا بە سادەیی چاویان لێ دابخەم و بە سەریاندا تێپەڕم، بەڵكو بۆ ماوەیەكی زۆر بە خۆیانەوە گیرم دەدەن و لەگەڵ خۆیاندا دەمبەن و بە تەواوی لە ژیان دامدەبڕن، جا وەك وتم ئەو شتانەش زۆرن هەر بۆنموونە: "هەژاری، دین، حەقیقەت، ئیمان، جارجارەش خوا" بەڵام شتێك كە خۆشم بەلامەوە سەیرە ئەوەیە هەندێكجار بیر لە عیشق دەكەمەوە كە بەحساب عیشق بابەتێكی ڕۆحی و قەلبییە، بۆیە بەخۆم دەڵێم بەخودا پێدەچێت دڵ و ڕۆحیش بیر بكەنەوە!

ماموٚستا وتی:

كاكە شەهرام بیر لە شتی زۆر گەورە و جێ بایەخ دەكەیتەوە.

منیش وتم:

ماموٚستا یەكجار بەو شێوەیەش نییە، هەندێكجار بیر لەو منداڵە دەكەمەوە كە تەنها لەبەرئەوەی پارەی نەداوە لە كڕینی تۆپەكەدا منداڵانی گەڕەك نایەڵن یاری بكات لە كاتێكدا ئەم منداڵە بۆ نەبوونی پارە هیچ خەتایەكی نییە، بەڵكو باوكی مردووەو كەس نییە ڕۆژانە پارەی بداتێ، یان بیر لەو كچە جوانە بچكۆلەیە دەكەمەوە كە ئەو ڕۆژە لە دوكانەكەی ناوبازاڕ بە گریانەوە بەرۆكی دایكی گرتبوو دەیوت هەردەبێت ئەو بازنانەم بۆ بكڕیت، بەڵام دایكیشی زمانی لاڵ بووبوو نەیدەزانی چۆن ئەو منداڵە تێبگەیەنێت كە ڕۆڵەگیان (تۆ قۆڵت نییە و بازنیش بۆ ئەوەیە



بکرێتە قوڵ) بەڵێ ماموستا جاروبار بیر لەم شتانەش دەکەمەوە.

ماموستا وتی:

ئەی باشە شەهرام گیان ئێستە تۆ سەرقاڵی چیت؟ دەخوێنیت یان خوێندنت تەواو کردووە؟

منیش وتم:

ماموستا گیان من ساڵی پار خوێندنم تەواو کرد، لە ئێستاشدا زۆر ڕۆژ دەچم بۆ کرێکاری، بەیناوبەینیش بۆ ماوەی دوو سێ ڕۆژێك ناچم بۆ کرێکاریەکەو، خەریکی خوێندنەوەی کتێب دەبم ئەگەر مەیلیشم لێ بێت سەردانی خزمێك دەکەم.

ماموستا وتی:

هەر ئەو شەوەی کە کاك دانا وتی "ئەمڕۆ کوڕێك هاتبوویە ئەشکەوتەکە بۆ بیرکردنەوە" یەکسەر ئەو گومانەم بۆ دروست بوو کە دەخوێنیتەوە.

منیش وتم:

ئەوە ڕاستە من دەخوێنمەوە، بەڵام تەنها چەند دانەیەك کتێبم هەیە، چونکە بە هەمووی نزیکەی دوو ساڵ و نیو بۆ سێ ساڵ دەبێت کە کتێب دەخوێنمەوە، بەڵام لەو سێ ساڵەشدا دوو جار کە نزیکەی دوو مانگی دەخایەند وازم لە کتێب خوێندنەوەش دەهێنا، چونکە بە خۆمم دەوت "ئەوا گریم ئەم کتێبانەی کە هەمە خوێندمەوە و تەنانەت لەوەش زیاتر، بەڵکو گریمان چەندەها کتێبی تریشم خوێندەوە، جاری وا هەبوو ئەوەندە دوور دەڕۆشتم

بە خۆمم دەوت: باشە ئەگەر ڕۆژێك بێت لەسەر بەرگی چەندەها کتێب نووسرابێت ((نووسەر:شەهرام ...)) واتە ئەگەر ڕۆژێك بێت خەڵك ئەو کتێبانە بخوێننەوە کە من نووسیومن، باشە چی ڕوودەدات؟" بەڵێ ماموٚستاگیان دووجار ئەم پرسیارانە لە خوێندنەوە و کتێب دووریان دەخستمەوە.

ماموٚستا ویستی دەم بکاتەوەو قسە بکات لەو کاتەدا دادە بەڕێزەکە بە سینییەکەوە هات کە چەندین قاش کاڵەك و دوو چەتاڵی لەسەر بوو، وتی: فەرموو بەدەم قسەکردنەوە لەم کاڵەکە خۆشەش بخۆن، من و ماموٚستا دەستخۆشیمان لێ کردو ئەویش جێیهێشتین، ئیتر ئەوە بوو ماموٚستا دەستی کردەوە بە قسەکردن، وتی:

شەهرام گیان ئێستە نیازی چیت هەیە؟ هیچ بڕیارێکت دەربارەی داهاتووت نەداوە؟

منیش وتم:

ماموٚستا گیان ئەوەندەی کە خۆم بیرم بێت زۆر کەیفم نەهاتووە بە بیرکردنەوە لە داهاتوو هەروەها بڕیاردان دەربارەی داهاتوو، وە ئێستاش شتێکی وام نییە دەربارەی داهاتوو کە جێگەی باسکردن بێت.

ماموٚستا وتی:

شەهرام گیان تۆ لە شار دانانیشیت؟

منیش وتم:

بەرەوەڵا ماموٚستا گیان.

ماموٚستا وتی:

ئەم چەند ڕۆژەی داهاتوو کۆتا ڕۆژەکانی منە لەم دێیەدا بۆیە ئەگەر خودا ویستی لەسەر بێت بە هۆی ئەوەی لە چەند ڕۆژی داهاتوودا دەوامی قووتابخانە تەواو دەبێت لەگەڵ خێزانم بە یەکجاری دەگەڕێینەوە بۆ شار و ئیدی هەر لەوێ دەمێنینەوە، چونکە وا بڕیارە ساڵی داهاتوو وەزارەتی پەروەردە بمگوازێتەوە بۆ ناوشار، وا بۆ دە ساڵە لەم دێیە ماموٚستام هەرچەندە دوای چوار ساڵ ئەگەر خۆم بمویستایە دەیانگواستمەوە بۆ ناوشار، بەڵام خۆم پێم باش بوو کە ئەم دە ساڵە لێرە بمێنمەوە.

جا بۆیە کە بە یەکجاری گەڕامەوە بۆ ناوشار پێم خۆشە پەیوەندیمان بەیەکەوە هەبێت.

منیش زۆر بە خۆشحاڵییەوە وتم:

جا لەوە باشتر.

ماموٚستا وتی:

دەی کەوایە شەهرام گیان گوێ بگرە با پێت بڵێم لە ناوشار ماڵی ئێمە لە کوێدایە، لە ناوبازاڕ مزگەوتی (......) دەزانیت؟

منیش وتم:

بەڵێ دەیزانم ماموٚستا.

ماموٚستا وتی:

لە دووکانی گوڵەبەڕۆژە فرۆشەکەی تەنیشت مزگەوتەکە بپرسە

کامەیە خانووەکەی (مرواری خان) یەکسەر نیشانت دەدا.

ئیدی من تەماشایەکی کاتژمێرەکەی دیوارەکەم کرد و وتم: زۆر باشە مامۆستا گیان من زۆر خۆشحاڵ بووم بە ناسینی بەڕێزتان، وا کات درەنگی کردووەو نیوەڕۆیە بۆیە ئیزنی من بدە با بڕۆم.

مامۆستا وتی:

شەهرام گیان بە دەنگی نزم ئەم قسانە بکە با باخان گوێی لێ نەبێت.

منیش بەدەم خەندەوە وتم:

مامۆستا گیان جارێ بۆ خۆت بڵێ خواحافیزت بێت دادە باخانیش ڕازی دەکەم.

مامۆستا وتی:

کوڕی باش ئەوە دوو دەقەی ماوە بۆ بانگی نیوەڕۆ دەچینە مزگەوت نوێژەکەمان دەکەین و دواتر دەگەڕێینەوە خودا چی دابوو دەیخۆین ئیدی ئەو وەختە بۆ خۆت سەر پشك بە دەڕۆیت یان لامان دەمێنیتەوە.

پاشان مامۆستا وتی:

تۆ ئەو مزگەوتە خۆشەی ئێمەشت نەدیوە، ئیدی هەرچۆنێك بوو ڕازی کردم و گوێمان لە بانگی نیوەڕۆ بوو بە دەنگێکی زۆر خۆش بۆیە بەرەو مزگەوت لە ماڵ چووینە دەرەوە، بەڵام لە کاتی چوونە دەرەوەمان مامۆستا بە دەنگێکی نەختێك بەرز وتی باخان

گیان ئەوە کاکە شەهرامم ڕازیکردووە بۆ نیوەڕۆ لامان بمێنێتەوە، لەو کاتەدا بانگ بێژەکە لەو شوێنەدا بوو کە دەیوت (اشهد أن لا اله الا الله) وتم:

ماموٚستا کافریش گوێی لەم دەنگە بێت شایەتومان دێنێت.

ماموٚستا وتی:

ئەوە ماموٚستایەکی هاوڕێمە لێرە لەگەڵ من دەوام دەکات، بەڵام لە سەرەتا کە هات بۆ ئەم دێیە نوێژیشی نەدەکرد.

ئیدی کە ماموٚستا ئەمەی وت ئەوەندەی تر بانگەکەم لا شیرینتر بوو، گەیشتینە مزگەوت، بەڵام چ مزگەوتێك (شوێنی دەستنوێژهەڵگرتنەکەی حەوزێك بوو لە ژێر دار توویەکدا لە ناو حەوزەکەشدا چەند دانەیەك ماسی تێدا بوو، بە ڕاستی مزگەوتێکی دڵگیر بوو، پێشتر وامدەزانی هیچ جێگەیەك وەك ئەشکەوتەکە ئارام نییە، بەڵام ئەو مزگەوتە پڕ بوو لە بێدەنگی، منداڵێکی یانزە بۆ دوانزە ساڵان هات بەرەو لای حەوزەکە بۆ دەستنوێژ هەڵگرتن، وتی:

باشی ماموٚستا؟

ماموٚستاش وەڵامی دایەوە:

سوپاس ئارام گیان ئەی تۆ چۆنیت، بۆ ئینتیحانی بەیانی سەعیت کردووە؟

منداڵەکەش وتی: بەڵێ.

ئیدی دوای هەڵگرتنی دەستنوێژ چووینە ژوورەوەو پاش

سەلام کردن ویستم دوو ڕکات نوێژی سوننەت بکەم، بەڵام فریا نەکەوتم یەکسەر بانگبێژە دەنگ خۆشەکە دەستی کرد بە قامەت و ماموٚستای هاوڕێشم چووە پێشەوەو نوێژی دابەست، دوای تەواو بوونمان لە نوێژو خوێندنی چەند زیکرێك مزگەوتەکە وردە وردە چۆڵ بوو تەنها من و ماموٚستاو بانگ بێژەکەو کاك دانا ئەوەی کە ڕۆژی پێشووتر بە شوانی هاتبوو بۆ لای ئەشکەوتەکە مابووینەوە، هەروەها دوو حاجی بەتەمەنیش مابوونەوە ماموٚستا لە میحرابی مزگەوتەکە هەستایەوەو منیش هەستام چووم بەرەو لای دواتر بانگبێژەکە هات بەرەو لامان و وتی ماموٚستا ئەکرەم سەلاموعەلەیك ئیدی لەو کاتەدا زانیم کە ماموٚستا ناوی ئەکرەمە دواتر کوڕە بانگبێژەکە دەستی هێنا بەرەو دەستی من و ماموٚستا ئەکرەمیش بەیەکتری ناساندین، بۆیە من خۆم پێ نەگیرا هەر لەویا بە بانگبێژەکەم وت:

بە ڕاستی دەنگت تەواو سەرسامی کردم.

ئەویش وتی:

سوپاس بۆ خوا، کە ئەو دەنگەی پێ بەخشیوم.

پاشان ماموٚستا ئەکرەم دەستێکی بۆ کاك دانا ڕاکێشاو وتی:

شەهرام گیان خۆ ئەوە دەناسیت؟

منیش وتم:

بەڵێ ماموٚستا گیان ئەوە کاك دانای ئازیزە، شتێکی بۆ نەکردووم کە نەیناسمەوە، دوێنێ لەو برسێتییەدا فریام کەوت.

پاشان کاك داناش هاتە لامان و مەرحەبایەکی گەرمی کردین و وتی:

ماموستا ئەکرەم خۆم حازر کردبوو پێت بڵێم بمبوورە کوڕەکەی لای ئەشکەوتەکە تا ئێستاش نەهاتووە. بەدەم قسەکردن و لێك جیابوونەوەوە هەر یەکەو بەرەو ماڵی خۆی ڕۆشتەوە، من و ماموستا ئەکرەمیش هاتینەوە بۆ ماڵەوەو، خێزانی ماموستاش بەخێرهاتنێکی زۆر گەرمی لێکردینەوە و وتی:

فەرموونە ئەم ژوورە نان حازرە.

چووینە ژوورەکە بینیم سفرە ڕاخراوەو لە بەشی سەرەوەی ژوورەکەش کتێبخانەیەکی گەورەی پڕ لە کتێب بوونی هەبوو، هەروەها لەولای سفرەکەش کتێبێکی فارسی کە لە بیرم نەماوە چ کتێبێك بوو لەگەڵ کتێبێکی تر کە لێی نووسرا بوو "دیوانی مەولەوی" وە دەفتەرێك و یەك دوو پێنووسیش دانرابوو.

بە فەرمووکردنی ماموستا ئەکرەم و خێزانی دەستمانکرد بە نانخواردن، چێشتەکە برنج و شلەی تەماتە بوو، لە کاتی نانخواردنەکەداو بەدەم پاروو گرتنەوە وتم:

ماموستا ئەم خانووە گڵینەی ئێوە بۆ من زۆر ئارامی بەخشە، کاتێك خۆم لە ناویدا دەبینمەوە ئەوەندە شادم خەریکە توشی غرور دەبم و خۆمم لێ دەگۆڕێت.

ماموستا ئەکرەمیش پاش چەند چرکەیەك وتی:

شەهرام گیان تۆ ئەوە دەزانیت کە تەنانەت خوای گەورەش

ماڵی گڵینی پێ خۆشە؟

منیش زۆر بە تامەزرۆیی ڕوونکردنەوەی ئەو قسەیەوە، وتم:

ماموٚستا ئەکرەم ئەمە یەعنی چی؟

ماموٚستاش وتی:

مەگەر خوای گەورە زانا نییە؟ بە دڵنیاییەوە با، دەی کەواتە خوای گەورە زانایە بەو شتانەی ڕوویان داوەو ڕوو دەدەن، هەر بۆیە خوای گەورە ئەوەشی زانیوە کە ڕۆژێك دێت دڵی ئێمە دەکاتە ماڵی خۆی، جا ئەوەندەش ماڵی گڵینی پێ خۆشە بۆیە دڵی ئێمەی لە گڵ دروست کردووە.

ئیدی منیش زۆر بە سەرسامی و شادییەوە سەرم لەقاند و وتم:

"بە ڕاستی جوانە".

نانخواردن تەواو بوو، هەڵبەتە نانخواردنی من تەواو بوو چونکە من هەمیشە کەم دەخۆم و خێراشم، بۆیە بە جامە فافۆنەکەی سەر سفرەکە کەمێك ئاوم خواردەوەو وتم:

خودا نەیبڕێت و دەستەکانی تۆش خۆش بێت دادە باخان بە ڕاستی خواردنێکی بەلەزەت بوو.

دادە باخان وتی:

کاك شەهرام خۆ ئەوەندەت نەخواردووە تا بزانیت بەلەزەت بوو یان نا.

منیش وتم:

دەستەکانت خۆش بێت هەر ئەوەندەم بۆ خورا، قابیلە شەرم

بکەم.

مامۆستا ئەکرەمیش بەدەم نانخواردنەوە وتی:

باخان گیان وازی لێ بێنە خۆی زەرەر دەکات، خۆ ئێمە تا ئێوارە نانی تر ناخۆین.

منیش وتم:

جا با نەیخۆن، من کەمێکی تر دەگەڕێمەوە بۆ شار.

ئیدی ئەوە بوو هەستامە سەر پێ و ڕۆشتمە بەشی سەرەوەی ژوورەکە بۆ سەیرکردنی کتێبەکانی ناو کتێبخانەکە، زۆربەی کتێبەکان ئەدەبی و دینی بوون بڕێکی کەمیش کتێبی فکری و فەلسەفی تێدا بوو هەروەها دوو خانەی کتێبخانەکە پڕ بوو لە کتێبی فارسی، هەروەها لە بەشی خوارەوەیش کۆمەڵێك شریتی کاسێت و سیدی لە تەنیشت تەسجیلێکی بچکۆلەوە دانرابوون کە ئەم شریتانە کەمێك سەرنجیان ڕاکێشام بۆیە لام کردەوە و وتم:

مامۆستا پرسیارێك بکەم؟

مامۆستا وتی:

فەرموو شەهرام گیان.

منیش وتم:

ئەم کاسێت و سیدییانە چین؟

مامۆستا وتی:

ئەوانە قسەو بابەت و کۆڕو وتارەکانی چەند پیاوێکی بە تواناو ڕۆشنبیرن.

ئیدی من زۆر درێژەم نەدایەو وتم:

عەفوو مامۆستا گیان نانەکەت بخۆ.

مامۆستاش وتی:

خودا نەیبڕێت منیش تەواو بووم.

ئیدی مامۆستاش هەستایەوە و وتی:

باخان گیان یاخودا ئەو دەستانەت خۆش بێت و خودا بۆ منت بهێڵێت، دواتر لەگەڵ دادە باخان کەوتنە کۆکردنەوەی سفرەکەو لابردنی، دوای ئەوەی بە تەواوی سفرەکەیان کۆکردەوە، من وتم:

مامۆستا گیان ئەوە نانەکەی نیوەڕۆم لا خواردن جا ئێستا ئیزنم بدە با بڕۆم.

مامۆستا وتی:

هەرچەندە زۆر حەز دەکەم لامان بمێنیتەوە و نەڕۆیت، بەڵام پێش نوێژ بەڵێنی ئەوەم پێدایت کە دوای نانخواردن ئازادی لە بڕیاردانی مانەوە یان ڕۆشتن، بەڵام شەهرام گیان با چا حازر بێت چایەکیش بخۆوە جا بڕۆ.

منیش وتم:

بەخودا مامۆستا من زۆر چا خۆر نیم، بیخۆم و نەیخۆم کێشەم نییە، تا درەنگتر نەبووە با ئێستە بڕۆم چاکترە.

ئیدی چووین بەرەو حەوشەکەو مامۆستا هاواری کرد باخان گیان شەهرام جێمان دەهێڵێت، دادە باخانیش هات وتی:

ئەوە بۆ کوێ کاک شەهرام؟

منیش وتم:

دەبێت بگەڕێمەوە.

ئیتر دادە باخانیش زۆر داوای کردو پێی خۆش بوو لایان بمێنمەوە، بەڵام هەرچۆن بێت ڕازیم کردن و خوداحافیزیم لێکردن و کۆتا قسەی مامۆستا ئەکرەمیش ئەوە بوو کە وتی:

"هەناسەکەم ئاگات لە خۆت بێت".

کە تا ئێستە هیچ کەسێك لە خوداحافیزیدا وای پێ نەوتبووم، ئیدی لە دێکە دەرچووم و بەرەو شەقامە سەرەکیەکە بەڕێکەوتم کە نزیکەی پانزە خولەکێك لە دێکەوە دوور بوو، ئەوە بوو بەدەم بیرکردنەوەوە ڕێگاکەم دەبڕی بەرەو شەقامە سەرەکیەکە "بیرکردنەوە لە خۆم لە ئەشکەوتەکە لە برسێتییەکەم لە کاك دانا لە کانییەکە لە شوانە قسەخۆشەکە لە هەموویشی زیاتر لە مامۆستا ئەکرەم و قسە شیرین و ڕەفتارە نەرم و نیان و لەسەرخۆکانی" بەدەم ئەم بیرکردنەوانەوە نزیکەی دە خولەکێك ڕێگام بڕی لە پڕێکا لە دواوە دەنگی سەیارەیەك هاتە گوێم، ئاوڕم دایەوە بینیم ڕووەو من دێت، کە گەیشتە لام وەستا، تەنها شۆفێرەکەی تێدا بوو، پیاوێکی بەتەمەن دیار بوو، وتی:

چۆنی کاك شەهرام؟

منیش بە ترس و سەرسامییەوە وتم: سوپاس مامە گیان.

وتی: وەرە سەرکەوە.

وتم: بۆ کوێ دەچیت؟

وتی: تۆ بۆ شار ناچیت؟

وتم: با بۆ شار دەچم.

وتی: دەی کەواتە وەرە سەرکەوە.

منیش هەرچۆنێك بێت بە ترسەوە سەرکەوتم، سەیارەکەشی تویێتایەکی دەبڵ بوو، کە سەرکەوتم بەرلەوەی قسە بکەم، ئەو وتی:

بەخێربێیت کاکە شەهرام.

منیش وتم:

یاخودا خۆت بەخێربێیت مامە گیان سوپاست دەکەم.

وتی:

تۆ من ناناسیت بەلاّم من تۆ دەناسم.

وتم:

نەوەلاّ من تۆ ناناسم، بەلاّم تۆ چۆن من دەناسیت؟

وتی:

هەرگیز منت لە شوێنێك نەبینیوە؟

منیش وتم:

با کەمێك بیر بکەمەوە.

وتی:

بیری لێ مەکەوە با بە بیرکردنەوە ماندووت نەکەم و خۆم پێت بڵێم من چۆن تۆ دەناسم.

وتی:

من خەڵکی ئەم دێیەم کە ئێستا تۆی لێ بوویت جا کارێکی

شارم بۆ دروست بووە، وەکو هەمیشە بەرلەوەی بکەومە ڕێ بەرەو شار چووم بۆ لای مامۆستا ئەکرەم.

وتم:

مامۆستا گیان من دەچم تا شار و لەوانەیە بگەڕێمەوە هیچت پێویست نییە بۆت بێنم؟

ئەویش وتی:

نا هیچ پێویستییەکم نییە جگە لە سەلامەتیت، بەڵام کەمێك پێش ئێستا برادەرێکم لامان بوو گەڕایەوە بۆ شار بۆیە زۆرت مەمنون دەبم ئەگەر بینیت هەڵیگرە و بیگەیەنە شار.

منیش وتم:

بەسەرچاو مامۆستا گیان، بەڵام ئەو برادەرەت ناوی چییە؟

مامۆستاش وتی:

ناوی شەهرامە.

ئیدی کە شۆفێرەکە ئەم قسانەی کرد بە تەواوی ئارامی و سوکنایم بۆ گەڕایەوەو لە ترس و دڵەڕاوکێ ماڵئاوایم کرد.

بەدەم ڕۆشتنەوە ڕووەو شار کە نزیکەی یەك کاتژمێر لە گوندەکە دوور بوو، مامەی شۆفێر زیاتر قسەی دەکرد و منیش بەڵێم بۆ دەکرد جاروباریش قسەکانی بریتی بوون لە پرسیارکردن بۆیە منیش لە بری بەڵێ کردن دەبوایە وەڵامی پرسیارەکانی بدەمەوە، بۆنمونە دوای کەمێك لەو قسانەی لە سەرەتاوە کردی پرسیاری ئەوەی کرد:

کاکە شەهرام تۆ و مامۆستا ئەکرەمی ئازیز چی یەکترن؟

پرسیارەکە بۆ من زۆر لە ناکاو بوو چونکە نەمدەزانی ئەو بەسەرهاتەی بۆ باس بکەم کەتیایدا من و مامۆستا ئەکرەم یەکترمان ناسی یاخود بە جۆرێکی دیکە وەلآمی بدەمەوە، بەلآم هەرجۆرێك بێت لە وەلآمدا وتم:

لەگەڵ مامۆستا ئەکرەم برادەرین.

مامەی شۆفێر وتی: کاکە شەهرام مامۆستا هاوتەمەنی تۆ نییە، منیش وتم:

بە هۆی شتێکەوە یەکترمان ناسی.

ئەویش وتی:

دەی دیارە هەر بەهۆی کتێب خوێندنەوە و ئەو جۆرە شتانەوە بووە.

منیش وتم:

تەقریبەن شتێکی لەو جۆرە، بەلآم چۆن بوو تۆ یەکەم شت کتێب هات بەخەیاڵتدا؟

ئەویش بەبزەیەکی زۆر جوانەوە وتی:

جا کاکە شەهرام مامۆستا ئەکرەم جگە لە کتێب و موحیببەت شتێکی دیکەی هەیە تا بیکاتە هۆکاری دروستکردنی دۆستایەتی و برادەرایەتی لەگەڵ ئەم و ئەودا!

مامەی شۆفێر زانی من بە دیقەتەوە گوێم بۆ ڕاگرتووە بۆیە بەردەوامی دا بە قسەکانی و وتی:

ئەم مامۆستا ئەکرەمەی برادەرت وەکو فریادڕەسێك وابوو بۆ ئەم گوندەی ئێمە، چونکە وا نزیکەی نۆ بۆ دە ساڵ دەبێت ئەم مامۆستایە ڕووی لە گوندەکەی ئێمە کردووە، لەو ماوەیەدا هەموو خەڵکی ناو گوند حەساونەتەوە بە جۆرێکی وا ئیسراحەتیان کردووە، ئەوە بۆ چەند ساڵێك دەبێت تەنانەت منداڵەکانیشمان پێکەوە شەڕیان نەبووە.

تەنانەت ئەو مندالأنەی وا فێرکردووە ئازاری ئاژەڵەکانیش نەدەن، لەم چەند ڕۆژەی پێشوودا بوو کە من دارێکم بە دەستەوە بوو دەمکێشا بە حەیوانەکاندا، کوڕەکەشم کە تەمەنی سیانزە ساڵ دەبێت پێمی وت "باوە چۆن دڵت دێ لەو حەیوانانە دەدەدیت؟!" کاکە شەهرام باوەڕ بکە کە کوڕەکەم ئەو قسەیەی کرد لە تەریقیدا هیچم بۆ نەوترا.

کە مامەی شۆفێر بەم جۆرە دەربارەی مامۆستا ئەکرەم قسەی دەکرد ئەوەندەی تر مامۆستام لا شیرینتر و خۆشەویستتر بوو، کەمێکی تر دەربارەی چاکی و گەورەیی مامۆستا ئەکرەم قسەی کردو دواتر وتی:

ئەی کاکە شەهرام تۆ بۆ وا بێدەنگی و قسەیەکمان بۆ ناکەیت؟

منیش لەو کاتەدا قسەیەکی باوکمم بیرکەوتەوە کە زۆرجار دەیوت "مرۆڤ کاتێك دەگات بە کەسێکی لە خۆی بە تەمەنتر وا باشترە گوێی بۆ بگرێت" بۆیە یەکسەر وتم :

مامە گیان من لەگەڵ پیاوە بە تەمەنەکاندا زۆرتر گوێ دەگرم

وەك لەوەی قسەیان لەگەڵدا بکەم، مامەی شۆفێر دەستی برد بۆ تەجیلی سەیارەکەو دەستی نا بە دوگمەیەکداو تەجیلەکەی هەڵکرد، پاش کەمێك مۆسیقا حەسەن زیرەك بە دەنگە خۆشەکەی دەیوت "هۆ کاکی جووتیار براکەم جوتت شەن گوڵ بێ، تۆوەکەت ڕازیانە ئەی وەی خەرمانت گوڵ بێ، هۆ کاکی ڕێبوار......." کە گۆرانییەکەی تەواو کرد مامەی شۆفێر وتی:

دەك سەد ڕەحمەت لەو گۆڕەت.

ئیدی بەدەم برینی ڕێگە و گوێگرتن لە چەند گۆرانییەك خۆمان لە سەیتەرە (بازگە)کەی نزیك شار بینییەوە، دواتر گەیشتینە شار و لە شوێنێك کە بۆ من گونجاو بوو وتم بەشۆفێرەکە مامە گیان لە پێشەوە من دابەزێنە، بەڵام مامەی شۆفێر وتی:

جا بۆ خەجاڵەتی لای مامۆستا ئەکرەممان ناکەیت، کاکە شەهرام گیان میوانی مامۆستا ئەکرەم میوانی ئێمەیە، دەتبەمەوە بەردەرگایماڵەوە.

ئەم مامەی شۆفێرە زۆر ئینکاری ئەوەی لەگەڵ دەکردم کە بمباتەوە بەردەرگا، منیش هەر دەموت پێویست بەوە ناکات.

ئیدی مامەی شۆفێر قسەیەکی کرد، بەو قسەیەی زۆر زۆر هەستم بە تەریقی و خەجاڵەتی دەکرد، قسەکەش ئەوەبوو وتی:

شەهرام گیان چییە، لەوانەیە حەز نەکەیت من شارەزای ماڵتان بم، یان دەترسیت بێم بۆ ماڵتان و بمێنمەوە، بەڵام هەرچۆنێك

بێت ڕازیمکرد کە لەو شوێنەی خۆم ویستم دامبەزێنێت. دایبەزاندم و خوداحافیزیمان لە یەکدی کرد.

منیش بەرەو ماڵەوە دەستمکرد بە بڕینی ڕێگەکە ئەو ڕێگەیەی من گرتم تا ماڵەوە بیست و پێنج خولەکێکی دەخایاند، بەڵام مرۆڤ کاتێك بە ناوشاردا ڕێ دەکات ئەوە بێزاری دەکات کە کات زۆر بە زوویی تێدەپەڕێت!

لە ڕێگادا تا ماڵەوە بەهۆی بینینی چەند شتێکەوە چەند وێنەیەکی دیکەم دەهێنایەوە پێش چاوانی خۆم، یەکێك لەوشتانەی بینیم ئەو مزگەوتە بوو کە دەکەوتە نزیکی چەند دوکانێکەوە بە خۆمم وت کاتێك بە چاوەکانم سەیری ئەم مزگەوتە دەکەم ئەوە دەبینم ئەم مزگەوتەی ناوشار چەند ئەوەندەی مزگەوتەکەی ناودێ گەورەترە، بەڵام کاتێك سەیری دڵی خۆم دەکەم ئەوە دەبینم کە مزگەوتەکەی ناودێ چەندین ئەوەندەی ئەم مزگەوتەی ناوشار لە دڵی مندا جێی گرتووە "تەنانەت ماڵەکانی خوداش جیاوازن".

پاش کەمێکی تر لە ڕۆشتن دەنگی زەنگی ئەو قوتابخانەیەی بە لایدا تێپەڕیم وە دەنگی هۆڕینی ئەو سەیارەیەی بە لامدا تێپەڕی و دەنگی ئەو غاز فرۆشەی بە شیشێك دەیدا بە بتڵی غازەکاندا و بە دەنگی خۆیشی هاواری دەکرد غاز... غاز... هەموو ئەم دەنگانە دەهاتنە گوێم ئیدی بە هۆی بیستنی ئەو دەنگانەو بینینی هەندێك لە خاوەنی دەنگەکان بە خۆمم دەوت "عەسرانی

شار وەکو ڕۆژی حەشر وایە مرۆڤ ناتوانێت تیایدا ئارام بێت بە پێچەوانەی عەسرانی لادێ و کانییەکەی بەردەم ئەشکەوتەکە، مرۆڤ ناتوانێت لەسەر کانییەکەی بەردەم ئەشکەوتەکە دابنیشێت و بیر نەکاتەوە، یاخود دیمەنی ئەو حاجیەی لەچکێکی سپی پێچاندبوو بە سەریەوە و دوای عەسر خۆی گەیاندبوویە سەر کانییەکە "کە من تا ئێستاش نازانم ئەم پیاوە پیرە چۆن توانیبووی خۆی بگەیەنێتە سەر ئەو کانییە!" دەنکەکانی تەسبیحەکەی دەجولاندو زیکری﴿لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ﴾ی دەخوێند کە پێدەچوو ماناکەشی نەزانێت.

گەیشتمەماڵەوە و دایکم بەخێرهاتنەوەی لێکردم، وتی:

شەهرامەکەی دایە ئەمجارە لە جارەکانی تر زیاترت پێچوو، ئێستەش زۆر ماندوو دیاریت؟

وتم: دایە شتێکی وا نییە ئەوە ماندووبوونی ئەم دوو شەوەیە کە لە ئەشکەوتەکە بووم.

ئیدی دوای ئەوەی لەگەڵ دایکم کەمێك پێکەوە دانیشتین من بە نیازی ئیسراحەتکردن ڕاکشام، بەڵام هەستم بە گەرما دەکرد بۆیە هەستام پانکەکەم داگیرساند و لەسەر ژمارە یەك دامنا پاشان ڕاکشامەوە و نزیکەی کاتژمێرێك نووستم دواتر هەستام و نوێژی عەسرم کرد.

تا ئێوارە خۆم سەرقاڵ کرد بە یەك دوو شتەوە کە ئەوانیش

یەکێکیان کتێبێك بوو باسی "قەزاو قەدەر"ی دەکرد، شتەکەی دیکەش ئەوە بوو لە پاش. ئەو کتێبە هاتمە ئەو ژوورەی تەلەفیزیۆنەکەی لێبوو خۆم سەرقاڵ کرد بە تەماشاکردنی تەلەفزیۆنەوە، لە ناکاو دەنگی زەنگەکە هات، ویستم بچم دەرگای حەوشە بکەمەوە لە دوورەوە بینیم باوکم هاتە ئەمدیو دەرگای حەوشەوە "ئاخر باوکم هەروا عادەتی کردبوو هەمیشە بەر لە هاتنە حەوشە زەنگی لێدەدا".

ئیدی منیش هەستام و زۆر بە ئاسایی بەرەو ڕووی باوکم ڕۆشتم و بەخێرهاتنەوەم لێکرد، ئەویش وتی شەهرام گیان خۆت بەخێربێیتەوە دواتر هاتینە ژوورەوە و کەمێك هەواڵی یەکترمان پرسی، باوکم وتی:

شەهرام گیان ئەمجارەیان زیاتر مایتەوە، دەنگوباسی ئەو دەشت و دەرە؟

منیش وتم:

باوەگیان وەك هەمیشە ئەوێ زۆر خۆشە، ئەی تۆ لەگەڵ ئیش و کار و دوکانەکە حاڵت چۆنە؟

باوکم وتی:

وەڵا خۆم زۆر باشم، دوکانیش هەروەك جارانە خراپ نییە.

منیش هەستام پەرداخێك ئاو بێنم بۆ باوکم، کە هاتمەوە باوکم وتی: شەهرام ئەرێ دایکت کوا؟

وتم: لە سەربانە.

وتی: ئەی دایکت پێی نەوتیت کە دوێنێ وەستا عەلی هات بۆ ماڵەوە؟

وتم: نا دایکم پێی نەوتم، بەڵام باوە وەستا عەلی بۆچی هاتبوو؟

باوکم وتی:

کوڕم هاتبوو هەواڵی تۆی دەپرسی، دەیوت ئەوە شەهرام لە کوێیە؟ بۆچی وا بە جارێ خۆی لێ ون کردین و دیار نەما؟

ئیدی منیش پێم وت:

وەستا عەلی گیان شەهرام چووەتە سەفەر بۆ لای ئەو خزم و کەسانەی.

وەستا عەلیش وتی:

دەی باشە ئەگەر گەڕایەوە با بێت بۆ لام.

دوای ئێوارە سەردانێکی وەستا عەلیم کردو کەمێك لای دانیشتم، ئەویش وتی: حەمە شەهرام تۆ بەیانی مەیە بۆ ئیش، چونکە بە کرێکاری ترم وتووە.

منیش زۆرم پێ خۆش بوو کە وتی بەیانی مەیە بۆ ئیش.

دواتر لای وەستا عەلی هەستام و گەڕامەوە بۆ ماڵەوە، ئەو شەوە هەر بیرم لە مامۆستا ئەکرەم دەکردەوە، چەند جارێکی تر بۆ هەمان مەبەست چووبووم بۆ ئەشکەوت، کە دەگەڕامەوە بۆ ماوەی یەك دوو ڕۆژ هەر بیرم لە ئارامی و لەزەتی ناو ئەشکەوت دەکردەوە، بەڵام ئەمجارەیان جیاواز بوو، بیرکردنەوە لە مامۆستا ئەکرەم و قسە شیرین و سەرنجە پڕ لە موحیببەتەکانی بەجارێك

ئەشکەوتی لەبیر بردمەوە، کتێبێکم بە دەستەوە بوو هەرچیم دەکرد نەمدەتوانی بە شایەنی خۆی بیخوێنمەوە، چەند دێڕێکم دەخوێندەوەو ڕاستەوخۆ یەکێك لە ڕووداوەکانی ئەو دوو ڕۆژەی پێشوو سەرنجی منی بەرەو لای خۆی ڕادەکێشا، ئیدی هەر لەم حاڵەدا بووم، پاش کەمێك لە شوێنی دانیشتنەکەی خۆم سوڕامەوە و سەرێکم هەڵبڕی بە مەبەستی تەماشاکردنی کاتژمێرەکە، بەلام بینیم کاتژمێر دەونیوە، بۆیە بەسەرسوڕمانێکەوە بە خۆمم وت باشە کات بۆ ناڕوات، نەمتوانی باوەڕ بە کاتژمێرەکەی ئەو ژوورە بکەم بۆیە هەستام چووم پەرداخێك ئاوم خواردەوەو تەماشای کاتژمێری ژوورەکەی ئەودیوم کرد بینیم وا دە خولەکی ماوە بۆ کاتژمێر دوانزەی شەو بۆیە چووم دەستنوێژێکم هەڵگرت و نوێژی خەوتنان و سێ ڕکاتی ترم کردو نووستم.

ئیدی ماوەی یانزە ڕۆژم بەڕێکرد کە شەش ڕۆژیان چووم بۆ کرێکاری و ڕۆژێکیش بە هۆی کارێکەوە تا نزیکی ئێوارە لەگەڵ هاوڕێیەکم بووم چوار ڕۆژەکەی تریش بە خوێندنەوەی کتێبێکەوە خەریك بووم، ئەو کتێبە لە ماڵی دایە گەورەم هێنابووم هی خاڵم بوو، کتێبەکە زۆر کۆن بوو ئەوەندە کۆن بوو بەرگی پێشەوەی پێوە نەمابوو وە چەند لاپەڕەیەکیشی ئەگەر بە وریایی مامەڵەت لەگەڵ نەکردایە ئەوا لە کەلْك دەکەوت، ئەو کتێبە ڕۆمانێك بوو بە ناونیشانی "ئەو وەرگێڕەی خۆی لێ بوو بە نووسەر" نووسەری ئەم ڕۆمانە زۆر بە ئاشکرا باس لە وەرگێڕێك دەکات کە خەریکی

دزیکردنە هەتا لە یەکێك لە لاپەڕەکانی ڕۆمانەکەدا دەڵێت "تەنها شتێك مایەی دڵخۆشیمان بوو ئەوە بوو بە خۆمان دەوت ئەو شتەی نووسین و دنیای کتێب لە کایەکانی دیکەی وەکو سیاسەت و بازرگانی و ڕاگەیاندن جیا دەکاتەوە ئەوەیە لەنووسیندا دزی بوونی نییە، بەڵام نەمردین و ئەوەشمان بینی" تەنانەت نووسەری ئەم ڕۆمانە دەڵێت چەند جارێك ویستم ڕۆمانەکەم ناو بنێم "نووسەرە دزەکە" بەڵام ئەخلاقی نووسینم ڕێگەی ئەوەی پێ نەدام.

یاخود لە لاپەڕەیەکی تردا دەڵێت "ئەگەر بڕیار بێت بەمە بوترێت نووسەر ئەوا بەقەد ژمارەی وەرگێڕەکان نووسەرمان هەیە" هەروەها چەند دێڕێك دوای ئەمە دەڵێت "ئەگەر ئەم نووسەرە ساختەیە وەرگێڕی کتێبی پیرۆز بوایە ئەوا خۆی لێ دەبوو بە خودا!" بەهەرحاڵ ئەم ڕۆمانە پڕ بوو لە ڕستەی ڕاستەقینەو خۆش واتا، بەڵام کۆتا دێڕی ڕۆمانەکە زۆر سەرنج ڕاکێش بوو کە نووسەر نووسیبووی "ئەو کاتەی دوو زمان دەزانیت هیچ شتێك ئاسانتر لە بوون بە نووسەر نییە هەڵبەت نووسەرێك بە وێنەی ئەو وەرگێڕەی خۆی لێبوو بە نووسەر".

نزیکەی دوو کاتژمێری مابوو بۆ بانگی عەسر من لە ماڵ دەرچووم و بە سواری پاس خۆم گەیاندە بازاڕ، ئیدی تا کاتی مەوعیدەکەمان بە ناو بازاڕدا سوڕامەوە کە زیاتر بە مەبەستی گەڕان بە کتێبخانەکاندا دەگەڕام، هەروەها دوو کتێبیشم کڕی.

بۆ نوێژی عەسر لەو مزگەوتەی کە مامۆستا ناونیشانەکەی پێدام ئامادە بووم، بە خۆمم وت لە دوای نوێژەکە دەچم بۆ لای کابرای گوڵەبەڕۆژەفرۆش و پرسیاری ماڵی مامۆستای لێ دەکەم، بەڵام کە نوێژ تەواو بوو وردە وردە نوێژخوێنەکان مزگەوتەکەیان جێدەهێشت ئیدی لە نزیك پایەکەوە مامۆستا ئەکرەمم بینی هەڵدەستایەوە بۆیە منیش هەستامەوە، مامۆستا ئەکرەم بەرەو لای من و منیش بەرەو لای ئەو دەڕۆیشتم لەو جێیەی بەیەك گەیشتین مەرحەبای یەکترمان کرد و ئەملاو ئەولای یەکترمان ماچ کرد، لە پاش ئەحواڵپرسینی خۆم مامۆستا ئەکرەم هەواڵی دایك و باوکم و خوشك و براکانمی پرسی.

منیش وتم: هەموومان باشین ئەی دادە باخان چۆنە؟

وتی: سوپاس بۆ خودا ئەویش باشە.

ئیدی چووینە دەرەوەی مزگەوتەکەو بەرەو ماڵی مامۆستا ئەکرەم ڕۆشتین کە سێ چوار خولەکێك ماڵیان لە مزگەوتەکەوە دوور بوو کە گەیشتینە بەردەم دەرگایەکی یەك تاکی بچکۆلانە مامۆستا ئەکرەم وتی فەرموو شەهرام گیان بڕۆ ژوورەوە، وتم بەخودا نابێت مامۆستا گیان دەبێت تۆ پێش بکەویت، چووینە ژوورەوە و دانیشتین مامۆستا ئەکرەم هەستا چوو دوو پەرداخ ئاوی هێنا و دانیشت، وتی شەهرام گیان باخانیش زۆری پێخۆش بوو تۆ دێیت، بەڵام کەمێك بەر لە نیوەڕۆ چوو بۆ نەخۆشخانە چونکە خوشکێکی لە نەخۆشخانەیە و کەمێك ناساغە.

ماموٚستا زانی ئەو عەلاگەی کە بەدەستمەوەیە کتێبی تیایە، بوٚیە پرسی: شەهرام گیان ئەمانە کتێبی چین؟

منیش لە عەلاگەکە دەرمکردن، وتم: ماموٚستا گیان ئەم دوو کتێبە بەرلەوەی بێم بوٚ مزگەوتەکە کڕیم، ماموٚستاش گرتی بە دەستیەوە و کەمێك سەیری کرد، بەڵام لەو کتێبەیاندا کە بەرگێکی ڕەشی هەبوو کەوتە سەر لاپەڕەیەك، ماموٚستا وتی:

شەهرام گیان ئەم بەشەیان بابەتی کاك (......)ە.

وتم: کاك (......) کێیە؟

وتی: کاك (................ )ە، نایناسیت؟

وتم: نەوەڵا ناویم نەبیستووە.

ماموٚستاش وتی: خوٚ ئەوەت بیر ماوە کە لە لادێکە هاتیتە ماڵ خوٚمان لە ژووری کتێبخانەکە پرسیاری ئەوەت لێکردم کە وتت "ماموٚستا ئەم کاسێتانە چین؟".

وتم: بەڵێ لە بیرمە.

وتی: دەی چەند دانەیەك لەو کاسێتانە وتار و بابەتی ،ئەم پیاوەن.

منیش وتم: ئادەی ماموٚستا گیان با سەیرێکی ئەو لاپەڕەیە بکەم.

وتی: ئێستە دەتدەمێ شەهرام گیان، کەمێکی تر سەیری کرد و دای بەدەست منەوە و کتێبەکەی تری هەڵگرت.

ئیدی منیش کەمێك لە لاپەڕەی ژمارە (...)ی کتێبە بەرگ

ڕەشەکە وردبوومەوە کە لەسەرەوە بە گەورەیی نووسرابوو "ماناکانی ئیمان" لە ژێر ئەویشدا بە بچوکتر لەوەی سەرەوە ناونیشانێکی دیکە نووسرابوو، لە ژێر ئەویشدا لای چەپەوە ناوی نووسەری بابەتەکە نووسرابوو.

ماموستا ئەکرەم وتی: من ئەم نامیلکەیەم بە فارسی خوێندووەتەوە نووسەرەکە زۆر جوان بابەتەکەی نووسیوە، ئیدی نامیلکەکەی دانایەوە، کە منیش کتێبە بەرگ ڕەشەکەم دانایەوە جارێکی تر هەڵیگرتەوەو وتی:

شەهرام گیان ئەگەر لە نووسینەکانی ناو ئەم کتێبە تێبگەیت بۆت دەردەکەوێت چەندە کتێبێکی چاکە.

ئیتر منیش لە بابەتی ئەو دوو کتێبە لامدا و وتم: باشە ماموستا ئەم خانووەتان چۆن دەستکەوتووە؟

وتی: ئەمە خانووی خۆمانە.

وتم: کڕیتان؟

وتی: نا نەمانکڕیوە من هەر لێرە لەدایکبووم و لێرەش گەورە بووم، ئەم خانووە تا پاریش دایکم و خوشکێکمی تیابوو، بەڵام پار دوای ئەوەی کە خوشکەکەم شوویکرد بە کوڕێکی خزممان و بردیان بۆ سوید، ئیتر پاش ماوەیەك دایکم وەفاتی کرد، منیش وا ئەمساڵ هاتمەوە ناوی.

منیش وتم: ماموستا هەرچەندە لادێت جێهێشت، بەڵام ئەم گەڕەکەشتان لە گەڕەکی شار ناچێت، زۆر خۆشە مرۆڤ کە دێتە ناو

ئەم كۆلانە تەسكە گلێنانەوە حەز ناكات لێی بچێتە دەرەوە.

مامۆستا وتی: ڕاست دەكەیت شەهرام گیان، تەواو بەو شێوەیە كە تۆ دەیڵێیت.

دواتر مامۆستا وتی: كتێب و شتەكانم لەم ژوورە داناوە، بەڵام بە نارێكی، ئەگەر تۆ پێت خۆشە بۆچی كەمێك ڕێكیان نەخەین؟

وتم: بەسەرچاو مامۆستا گیان.

هەستاین چووین بەرەو ژوورەكە، دەرگای ژوورەكەی كردەوە و بینیم چەندین كۆمەڵە كتێب لە تەنیشت یەكەوە هەڵچنرابوون، بەڵام كتێبەكان زۆر زۆر بوون، ژوورەكە تەنها ئەو كتێبانەو كتێبخانەیەكی تێدا بوو كە هەمان ئەو كتێبخانەیە بوو لە لادێكە لە ماڵ مامۆستا ئەكرەم بوو، كە چووینە ژوورەوە بۆ من جەوێكی زۆر خۆش بوو، تاقێك لە ناو دیوارەكەدا هەبوو لە ناویدا زۆر بە خەتێكی خۆش و بە جوانی نووسرابوو ﴿اللّٰهُ﴾ هەروەها لە سوچێكی ژوورەكەش هەر بە گەچ ڕەفەیەك دروستكرابوو چرایەكی زۆر جوانی لەسەر بوو بە دیواری لای چەپی ژوورەكەشەوە سێ وێنەی گەورە كە تا بەتەواوی نەچوومە نزیك وێنەكان نەمزانی بەدەست كێشراون، وە لە ژێرەوەی وێنەكاندا ئەم سێ ناوە نووسرابوو، لای ڕاستەوە "مەحوی، نوورسی، مەولەوی" لە تەنیشتی دووان لە وێنەكان چەند دێڕە شیعرێك نووسرابوو لە ژێر وێنەكەی دیكەشدا وتەیەك نووسرابوو، نووسینەكەی تەنیشت

وێنەکەی مەحوی ئەم شیعرە بوو:

بە نۆشی جانی وەردەگرم پیاڵەی زەهری هەر نێشێ
بە دەردی دڵ بچم گەر بێ لە جەوری تۆ دڵم بێشێ
بەوەم زانی لە باغا چقڵی گوڵ هەڵچەقیە داوێنی
کە لێرە دڵ لە سینەمدا برینی نەشتەری دێشێ
شوکر یار ئیزنی دام هەم گریە کەم هەم قوڕ بە سەردا کەم
بە جارێ شاهی من بەحر و بەڕی بەخشی بە دەروێشێ
لەمێ مەیدانی عیشقە کلکە ڕێوی ڕیشی تۆ زاهید
چ بێ قەدری؟ دەبێ گەر شێری بێتێ کلکی ڕاکێشێ
وتم: ڕوخسەت دە جانا، دا بە قوربانی لەبت کەم جان
وتی: بەحرێکی شەهد ئەڵبەت دەنیشێ پێیەوە مێشێ
خودا گرتوو دڵم چۆتن بە گژ شۆرو شەڕی عیشقا
بە نەصصی ئایە ئەفلاك و زەمین ئەم بارە ناکێشێ
سەنەد بێ مۆرو خەت دەعوی مەحەببەت کردنە "مەحوی"
تەعەششوق بێ دڵێکی داغدارو سینەیی ڕیشێ

نووسینی تەنیشت وێنەکەی نوورسیش ئەم چەند دێڕە بوو:
"ئەگەر نووری ئیمان لە مرۆڤدا جێگیر ببێت، ئەوا ئەو نوورە سەرجەم نەخش و نیگارە پڕ لە داناییەکانی خواوەند لە مرۆڤدا دەردەخات و دەیشیانخاتە بەردەستی خەڵکی تاکو بیانخوێننەوە،

ئیتر مرۆڤی ئیماندار بیریان لێ دەکاتەوەو، دەیانخوێنێتەوە و، لە خۆیدا بە تەواوی هەستیان پێدەکات و، کەسانی تریش دەخاتە خوێندنەوەیان، واتە وەك ئەوە وایە بڵێیت:

من سنعەت و بەدیهێنراوی پەروەردگاری مەزنم، بڕوانن چۆن چاکە و میهرەبانی ئەوم تێدا دەردەکەوێت".

ئەو دوو دێڕە شیعرەش لە ژێر وێنەکەی مەولەویدا نووسرابوو بریتی بوو لە:

ئاخ پەی خەڵوەتێ بدیام وە بێ خەم
سیوای تۆ دیدەم، کەس نەدیام وە چەم
دڵ پەی دیدەنت کام خەڵوەت سازۆ
تۆی دیدەیچم بی مەردم نمازۆ

وتم: مامۆستا ئەمەی نوورسی لە شیعر ناچێت.

وتی: شەهرام گیان ئەوەی نوورسی بۆیە لە شیعر ناچێت چونکە نوورسی شاعیر نەبووە.

دوای کەمێکی تر مامۆستا وتی: شەهرام گیان تۆ پێت باشە چۆن ئەم کتێبانە ڕێك بخەین.

وتم: مامۆستا گیان ئەوە خۆت باشتر دەزانیت.

وتی: زۆر باشە با بچم چەکوشێك و چەند بزمارێك بێنم بۆ ئەوەی کتێبخانەکەی پێ توندوتۆڵ بکەمەوە.

تا مامۆستا هاتەوە چەند کتێبێکم هەڵگرت تەماشام دەکرد و

دامدەنایەوە، بەڵام زوورزوو پێم خۆش بوو سەیرێکی تاقەکە بکەم چونکە زۆرم لا جوان بوو.

ئیدی مامۆستا هاتەوەو پێکەوە چەند بزمارێکمان دا لە کتێبخانەکەو دواتر لەسەر ویستی مامۆستا ئەکرەم هەردووکمان پێکەوە کتێبخانەکەمان هەڵگرت و بردمان نووساندمان بە دیواری بەشی سەرەوەی ژوورەکە، پاشان مامۆستا چوو پەڕۆیەکی هێنا و کەمێك خانەکانی ناو کتێبخانەکەی پاك کردەوە، منیش وتم:

مامۆستا باوەڕ ناکەم ئەم کتێبانە لە ناو ئەو کتێبخانەدا جێگەیان بێتەوە.

وتی: بەڵێ شەهرام گیان ڕاست دەکەیت، بڕیارمداوە کتێبخانەیەکی تریش دروست بکەم.

لەم قسانەدا بووین تەقەی دەرگا هات، مامۆستا ڕۆشتە حەوشەکەو هەر لە دوورەوە وتی فەرموو، منداڵێك دەرگاکەی کردەوە و وتی "ئێرە ماڵی کاك هیوایە؟" مامۆستاش وتی "عاقڵ گیان ئەو ماڵەی تەنیشتمانەوەیە، بە دەستی ئاماژەی بۆ لای ڕاست دەکرد".

ئیدی مامۆستا هاتە ژوورەوە وتی: شەهرام گیان وەرە با کەمێك دانیشین و نەختێك مزرەسێو بخۆین، مامۆستا چوو لە قاپێکدا هەندێك مزرەسێوی هێنا لەگەڵ ژێرپیاڵەیەك کە خوێی تیابوو، بەدەم سێوخواردنەوە مامۆستا وتی:

شەهرام گیان گەردنم ئازادکە ئەم عەسرە لە کاتم گرتیت.

منیش وتم: مامۆستا گیان من چیم کردووە.
پاش ئەوەی لە سێوخواردن تەواو بووین، وتم:
مامۆستا گیان تا کات لەوە درەنگتری نەکردووە، با من بڕۆم.
مامۆستا وتی: چۆنت پێ باشە ئاوا بکە، من زۆر موشتاق و تامەزرۆی بینینی تۆ بووم، بەڵام شەهرام گیان ئەگەر کتێبی دیکەت دانەناوە بۆ خوێندنەوە ئەوا دەست بکە بە خوێندنەوەی ئەم دوو کتێبەی کە کڕیوتە.
ئیدی دەستم برد بە تەوقەکردن خوداحافیزی لە مامۆستا بکەم، بەڵام مامۆستا وتی:
شەهرام گیان ڕاوەستە دیارییەکم بۆ داناویت با بچم بۆت بێنم مامۆستا ڕۆشتە ژوورەوەو گەڕایەوە زەرفێکی بە دەستەوە بوو، زەرفەکە بریتی بوو لە کاغەزێکی ڕەنگ زەرد بە تیپ کەپس کرابوو، هیچیشی لێ نەنووسرابوو.
دایە دەستم وتی فەرموو شەهرام گیان.
منیش وتم: زۆر مەمنون مامۆستا گیان هەوڵدەدەم شایەنی دیارییەکەت بم.
پاشان خوداحافیزیم لە مامۆستا کرد، بەڵام بەدەم خوداحافیزییەوە تا بەردەمی دەرگای حەوشەکە واتە تا ناو گەڕەکە تەسکەکەی خۆیان لەگەڵم هات و لە پاش خوداحافیزی کۆتا قسەی ئەوە بوو کە وتی "هەناسەکەم ئاگات لە خۆت بێت".
پاش ئەوەی کەمێك ڕۆشتم و لە گەڕەکەکەی ماڵی مامۆستا

ئەکرەم دوورکەوتمەوە، ویستم ڕاوەستم زەرفی دیارییەکە بکەمەوەو تەماشای بکەم، بەڵام وامنەکرد و بە خۆمم وت شەهرام لە ماڵەوە بە ئیسراحەت تەماشای دیارییەکەی مامۆستا بکە هەرچەندە دەستم دەدا لە دیارییەکە گومانم تەنها بۆ ئەوە دەچوو ئەوەی لە ناو ئەم زەرفە زەردەدایە جگە لە نامیلکەیەك هیچی تر نییە، ئیتر هەرجۆرێك بێت تا ماڵەوە دەستم نەبرد بۆ دیارییەکە، بەڵام لەناو پاسەکەدا جارێکی تر کتێبە بەرگ ڕەشەکەم دەرهێنا و نەختێك سەیرمکردەوە هەرچەندە دەمەوئێوارە بوو ناو پاسەکەش کەمێك تاریك بوو.

گەیشتمە ماڵەوە نوێژی ئێوارەم کرد و نانم خوارد پاشان نزیکەی سێ چارەك لەگەڵ دایك و باوکم دانیشتم بەدیار تەلەفزیۆنەوە، دواتر من هەستام چوومە ئەو ژوورەی کە دایکم پێی دەوت "ژوورەکەی شەهرامەکەم" لەوێ یەکسەر بە تامەزرۆییەوە دەستم برد زەرفی دیارییەکەم کردەوە بینیم نامیلکەیەك لە ناو زەرفەکەدایە، نامیلکەکە زۆر تازە نەبوو هەروەها بریتی بوو لە باسکردنی کۆمەڵە بەسەرهاتێکی ڕاستەقینە کە دوای ئەوەی چەند کەسێك لە ڕێگەی ڕاست لایاندابوو خودای گەورە بە شێوەی جیاجیا هەریەکەیانی ئاگادار کردبوویەوەو جارێکی دی گەڕابوونەوە بۆ سەر ڕێگەی دینداری و خواپەرستی، لە بەشی سەرەوەی لاپەڕەی یەکەم لە سوچی لای چەپ دیاربوو پێشتر شتی لێ نووسرا بوو، چونکە بە جافێکی ڕەنگی ڕەش خەت هێنرابوو

بەسەر نووسراوەکەداو لە تەنیشتییەوە نووسرابوو "پێشکەشە بە شەهرام گیان" منیش خۆم لە تەنیشتیەوە نووسیم لە لایەن "مامۆستا ئەکرەمەوە" هەر ئەوشەوە بە دووجار وەستانی چەند خولەکی لە خوێندنەوە، هەموو نامیلکەکەم تەواوکرد، بە بیرمدا نەدەهات تا ئەو کاتە نووسینی ئاوا کاریگەرم خوێندبێتەوە، لە کاتی خوێندنەوەی ئەم نامیلکەیەدا هێزێك جیا لە نووسەر شتەکانی بۆ ڕوون دەکردمەوە، بەڵام ڕوون کردنەوەیەك کە ئەگەر بشمویستایە خۆم لە گێلی بدەم هەر تێدەگەیشتم.

دوای چەند ڕۆژێك بە ویستی خودا لەگەڵ مامۆستا ئەکرەم لە شوێنێك یەکترمان بینی، مامۆستا پێی وتم شەهرام گیان سبەینێ عەسرەکەی مەجالت هەیە بڕۆین ئەو کتێبخانەیە بێنینەوە لای ئەو وەستایە؟

ئیدی منیش بڕیارمدا کە سبەینێ نەچمەوە بۆ ئیش، بۆیە وتم بەڵێ مامۆستا گیان من سبەینێ مەجالم دەبێت.

مامۆستا وتی: زۆر باشە شەهرام گیان، سبەینێ بۆ نوێژی عەسر لە هەمان مزگەوتەکەی ئەوجار ئامادەبە دواتر لەوێوە دەڕۆین.

سبەینێ دوای تەواوبوونی نوێژی عەسر مامۆستام بینی لە مزگەوتەکە، بەڵام بەتەنها خۆی نەبوو، بەڵکو کوڕێکی تریشی لەگەڵدا بوو، بە ڕوخساریدا هاوتەمەنی من بوو، هەستانەوەو مامۆستا بەدەست ئیشارەتێکی بۆ کردم کە دەیوت "وەرە بۆ

دەرەوە" منیش پاش کەمێکی تر هەستام و چووم بەرەو بەردەرگای مزگەوت، بەڵام مامۆستا ئەکرەم لەوناوە دیار نەبوو، تەنها ئەو کوڕە لەوێدا وەستابوو کە لەناو مزگەوتەکە لەگەڵ مامۆستا ئەکرەم بوو، بۆیە منیش هەنگاوێکم هەڵگرت و ویستم بگەڕێمەوە بەرەو ناو مزگەوتەکەو لەوێوە بچم بزانم مامۆستا ئەکرەم لای دەرگاکەی تری مزگەوتەکە چاوەڕێم ناکات "ئەو مزگەوتە دوو دەرگای هەبوو" بەڵام لەگەڵ ئاوڕدانەوەم بەرەو ناو مزگەوت ئەو کوڕە هاوتەمەنەی خۆم بە دەنگێکی زۆر لەسەر خۆ وتی: کاک شەهرام.

منیش بەرەو ڕووی ئەو وەرچەرخامەوە و وتم: بەڵێ براکەم.

ئیدی دەستی هێناو تەوقەو مەرحەبایی یەکترمان کرد، یەکسەر خۆیشی بە من ناساندو وتی: من حامیدم هاوڕێ و خزمی مامۆستا ئەکرەمم، وابزانم تۆش بە دوای مامۆستا ئەکرەمدا دەگەڕێیت؟

منیش وتم: زۆر خۆشحاڵم کاک حامید گیان، بەڵێ قەرارمان وابوو لەگەڵ مامۆستا ئەکرەم لەم مزگەوتە یەکتر ببینین.

کاک حامید وتی: ڕاست دەکەیت، مامۆستا ئەکرەم لە ماڵەوە پارەی حەقدەستی وەستای دروستکەری کتێبخانەکەی بیرچووبوو ڕۆشتووە بیهێنێت، ئێستە دەگەڕێتەوە.

وتم: زۆر باشە، خێری پێوەبێت.

به شێوەیەك وەستابووین کاك حامید ڕووی لەو ڕێگەیە بوو

کە ماموٚستا ئەکرەمی لێوە دەگەڕایەوە، منیش لەبەرئەوەی ڕووم لە کاک حامید بێت، پشتم لەو ڕێگەیەی ماموٚستا ئەکرەم بوو، بوٚیە کاک حامید وتی:

ئەوە ماموٚستا ئەکرەمیش گەڕایەوە، کە وای وت منیش ئاوڕم دایەوە بینیم وا ماموٚستا ئەکرەم بەرەولای ئێمە دێت.

کە گەیشتە لامان دەستی هێنا لەگەڵمان تەوقە بکات یەکسەر کاک حامید وتی "کاک شەهرام... ماموٚستا ئەکرەم" وەك ئەوەی من و ماموٚستا یەکەمجارمان بێت یەکتر ببینین و کاک حامیدیش بەیەکترمان بناسێنێت.

ماموٚستا ئەکرەم دەستی منی گرتبوو، بەڵام پێش ئەوەی مەرحەبای یەکتر بکەین ڕوویکردە کاک حامیدو وتی:

ئەی غەزالی ئەمیشت ناسی، ئیتر ڕوویکردەوە من و مەرحەبای یەکترمان کرد، بەڵام وەکو هەمیشە زمانی مەرحەبایی کردنی ماموٚستا ئەکرەم ئەوەندە شیرین و پڕچێژ بوو بەردەوام حەزم لە مەرحەبایی کردنی دەکرد.

ئیدی بەڕێکەوتین بەرەو دووکانی ئەو وەستایەی کتێبخانەکەی بوٚ ماموٚستا ئەکرەم دروست کردبوو، منیش پرسیم لە ماموٚستا ئەکرەم:

ماموٚستا گیان کاک حامید چی ئێوەیە؟

ماموٚستاش وتی:

شەهرام گیان باخانی خێزانم باشترین ئافرەتە، بەڵام یەك شتی

باش نییە ئەویش ئەوەیە کە غەزالی برای ئەوە.

یەکسەر کاك حامید وتی:

کاك شەهرام باوەڕ بکە هەموو ئەو باشیەی دادە باخان کە ماموستا باسیکرد بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە خوشکی منە.

منیش وتم:

کاك حامید بۆچی ماموستا ئەکرەم بە تۆ دەڵێت غەزالی؟

ماموستا ئەکرەم وتی:

شەهرام گیان با من جوابت بدەمەوە.

یەکسەر کاك حامید وتی:

نا نا ماموستا گیان تۆ جوابی مەدەرەوە، چونکە دەزانم وەکو هەموو ئەوانیتر کاك شەهرامیش بەهەڵە تێدەگەیەنیت.

ماموستا ئەکرەم وتی:

دەی باشە کاکی غەزالی خۆت وەڵامی بدەرەوە.

کاك حامیدیش وتی:

کاك شەهرام ماموستا ئەکرەم بە من دەڵێت غەزالی چونکە پێیوایە غەزالی هاوشێوەی من بووە، چۆن من تا ئێستا چەندین ڕێگەم تاقیکردووەتەوە غەزالیش وەکو منی کردووە.

ماموستا ئەکرەمیش بەدەم پێکەنینێکی خۆشەوە وتی:

ڕاست دەکات شەهرام گیان، غەزالییە ڕاستەقینەکە چەندین ڕێگەی چاکی تاقیکردووەتەوە، بەڵام ئەم کاك حامیدەی ئێمەش چەندین ڕێگەی... دەی با واز لەو مەسەلەیە بێنین.

ئیتر لەم قسانەوە بۆم دەرکەوت مامۆستا ئەکرەم و کاك حامید نێوانیان زۆر خۆشە و زۆریش یەکتریان خۆشدەوێت.

بەدەم قسەکردنەوە گەیشتینە دووکانەکە و کتێبخانەکەمان بارکرد، لەو کاتەدا کە پارەکەمان دایە دەست وەستاکەو ژماردی و وتی "ئەو چەند دینارەش خاتری هەرسێکتان مادام ئەهلی کتێب و خوێندنەوەن".

کاك حامید ڕویکردە مامۆستا و وتی:

ئەها مامۆستا گیان ئەوەش خێرو بەرەکەتی غەزالی.

لەم کاتەدا وەستاکە بە جۆرێکی لێهات، نەمدەزانی ئایا غەمبارە یان خۆشحاڵ، وتی:

لەبەرئەوەی ئەم کاکەیە ناوی غەزالی هێنا ئەوەش چەند دینارێك بۆ خاتری ئیمامی غەزالی، هەرچەندە مامۆستا ئەکرەم زۆر ئینکاری کرد لەگەڵ وەستاکە، بەڵام وەستاکە وتی مامۆستا گیان باوەڕ بکە لەبەر تۆ نییە لەبەر خاتری غەزالی ئەم چەند دینارەتان بۆ دەگێڕمەوە.

ئیتر مامۆستا ئەکرەم زۆر بە شیرینی وتی:

وەستا گیان من زۆر زۆر مەمنونی بەڕێزتم، لای خودا داوا دەکەم خێر بێتە سەر ڕێت.

خوداحافیزیمان لە وەستا کرد و بەرەو ماڵ لەگەڵ گەنجە عەرەبانچیدا بەڕێکەوتین، مامۆستا ئەکرەم وتی کوڕەکان ئەو پیاوە زۆر پیاوێکی ئازیزو لە دڵا شیرین بوو، هەوڵ دەدەم بە پێی مەجال لە داهاتوودا سەردانی بکەم.

کاك حامید وتی:

ماموستا چەند خۆش دەبوو ئەگەر هەموو پیشەوەرەکان فەیلەسوفەکانیان بناسیایە، ئەوەتا ئەم وەستایە فەیلەسوفێکی گەورەی وەك غەزالی دەناسێت چەندە مامەڵەی خۆشە و قسەی لەبەردڵانە.

ماموستا ئەکرەمیش ڕویکردە کاك حامیدو وتی:

غەزالی گیان من وا لەم پیاوە تێگەیشتم کە بە دیوە ڕۆحیەکەی غەزالی زیاتر کاریگەر بووە تا دیوە عەقڵیەکەی، واتە ئەم وەستا ئازیزە غەزالی وەکو عارفێك دەناسێت نەك وەکو فەیلەسوفێك.

جا لە کاتی کردنی ئەم قسانەدا من لای ڕاست و کاك حامید لای چەپ دەستمان گرتبوو بە کتێبخانەکەوە و ماموستا ئەکرەمیش یارمەتی کوڕە گەنجە عەرەبانچییەکەی دەداو لەگەڵی پاڵی دەنا.

گەیشتینە ماڵەوەو کتێبخانەکەمان داگرت و بردمانە ژووری کتێبەکان، ماموستا ئەکرەم وتی:

جارێ هەر بەمجۆرە وازی لێ بێنن با کەمێك ئاو بخۆینەوە و ئیسراحەتێك بکەین دوایی دێینەوە چاکی دەکەین، ئیدی چووینە حەوشەکە کورسی دانرابوو هەر لەوێ دانیشتین و دادە باخان بە سینییەکەوە کە سێ پەرداخ ئاوی لەسەربوو هات بۆ لامان و بۆ جاری دووەم وتی یاخودا بەخێربێنەوە، سینییەکەی هێنا بەرەو لای من وتی: فەرموو کاك شەهرام، منیش دەستم برد بۆ پەرداخێکیان، بەڵام دادە باخان وتی: عەفو کاك شەهرام ئاوی ناو

ئەو پەرداخەیان هی ماموستا ئەکرەمە چونکە ئەو حەزی لە ئاوی سارد نییە ئیتر منیش دەستم برد و پەرداخێکی دیکەم هەڵگرت.

دواتر کە سینییەکەی برد بەرەولای کاک حامید، کاک حامید وتی:

دادە وەستاکە لەبەر خاتری غەزالی برات بڕێك پارەی گەڕاندەوە بۆ ماموستا ئەکرەم، ئیتر من و ماموستا ئەکرەم بزە گرتینی، دوای ئەوەی ئاوەکەمان خوارد کەمێك دانیشتین، ئەمجارەیان دادە باخان سێ پەرداخ شەربەتی مێوژی بۆ هێنایین، ئێمە خەریکی خواردنەوەی شەربەتەکە بووین، دادە باخان چوویە ژوورەوە و گەڕایەوە وتی ماموستا وادیارە وەستاکە زۆر شارەزا بووە وا ئەوەندە بە جوانی کتێبخانەکەی دروستکردووە، ماموستا ئەکرەم وتی:

باخان گیان باوەڕ بکە تائێستا وەستای وام نەدیوە، زۆر پیاوێکی بە ئەدەب و موحتەرم بوو، پیاوی خەجاڵەت دەکرد، دوعای بۆ بکە تووشی خێر بێت.

منیش بە جۆرێك لە ماموستا ئەکرەمم پرسی:

ماموستا ئەرێ ئەو غەزالیە چ کەسایەتییەکە وا کاتێك کاك حامید لای وەستاکە ناوی برد یەکسەر وەستاکە بەو جۆرەی لێ هات "کە هەم غەمبار بوو هەم دڵشاد بوو؟!".

یەکسەر کاك حامید دەستی کرد بە قسەکردن، وتی:

بە ڕاست کاك شەهرام ئەو فەیلەسوفە گەورەیە (ئەبو حامیدی غەزالی) ناناسیت؟

منیش وتم:

کاك حامید بیرم دێ جارێکیان کتێبێکم خوێندەوە کە باسی هاوڕێی دەکرد، بەڵام لە بەرگەکەی نووسرابوو لە نووسینی ئیمامی غەزالی، جا ئیتر نازانم ئیمامی غەزالی هەر ئەو فەیلەسوفەیە کە تۆ دەیڵێیت؟

بەڵام کاك حامید بێدەنگ بوو، بێدەنگ بوونەکەشی بەو واتایە بوو کە من قسە ناکەم، فەرموو مامۆستا ئەکرەم گیان تۆ قسە بکە.

مامۆستا ئەکرەمیش زۆر بە ئارامییەوە وتی:

ئەم فەیلەسوفەی کاك حامید باسی دەکات هەمان ئەو ئیمامی غەزالییەیە کە تۆ کتێبەکەیت خوێندووەتەوە، بەڵام ئەم پیاوە بەڕێزە لە ئەزموونی ژیانی خۆیدا بە چەندین ڕێگادا ڕۆیشتووە و ئەزموونی کردووە، فەلسەفەی ئەزموون کردووە، تەسەوف و عیرفان و ئەو ڕێگایانەشی ئەزموون کردووە، جا ئەوانەی بە دیوە عەقڵی و فەلسەفیەکەی غەزالی کاریگەرن کاتێك باس لە غەزالی دەکەن بە فەیلەسوفێکی گەورەی ناو دەبەن بۆنموونە هەر ئەم کاك غەزالییەی لە تەنیشت من و تۆدا دانیشتووە، ئەوانەیشی بە دیوە ڕۆحی و مەعنەوی و ئیمانییەکەی ئەم پیاوە کاریگەر بوون بە "عارفێکی گەورە" ناوی دەبەن، دواتر مامۆستا ئەکرەم وتی جا نازانم شەهرام گیان تۆ تا چەند لە مەسەلەی (عیرفان و عارف) ئاگاداریت.

منیش وتم: مامۆستا لەوانەیە درۆ نەبێت ئەگەر بڵێم بە بێ مەبەست شتێکی کەم لەم دوو وشەیە (عیرفان و عارف) خەبەرم

هەیە.

مامۆستا ئەکرەم وتی: دەی جاریّ با لەوە گەڕێین ئەگەر خودا دەرفەت بدات لە کاتێکی گونجاودا باس لەو شتانە دەکەین.

مامۆستا ئەکرەم هەستایەوە و وتی:

کوڕەکان هەستن با بچین خەریکی چاك کردن و دانانی کتێبخانەکە بین، بۆیە هەستاین و چووینە ژوورەوە و لەو شوێنەی مامۆستا ئەکرەم پێی باش بوو کتێبخانەکەمان داناو جێگیرمان کرد.

ئیدی دواتر من و کاك حامید پێکەوە ماڵی مامۆستا ئەکرەممان جێهێشتوو تا ئەو جێیەی ڕێگامان یەك بوو پێکەوە بووین، لە ئەنجامی چەند خولەکێك قسەکردن کاك حامید ئەوەی پێ وتم کە خەریکی خوێندنەو لە قۆناغی سێیەمی زانکۆیە لە بەشی کوردی، دواتر یەکترمان جێهێشت، بەڵام من تەنها بە جەستە لە "وەستاکە و مامۆستا ئەکرەم و کاك حامید و قسە خۆشەکانی و خانووەکە و کۆڵانە دڵفڕێنەکەی ماڵ مامۆستا" جیا بووبوومەوە ئەگەرنا تا لە مەوقیفەکەی لای ماڵ خۆمان کە لە پاسەکەدا دابەزیم هەموو ئەو شتانە خەیاڵی منیان پڕکردبوو، ئەوەندە خەیاڵم بە توندی بەسترابوو بەو شتانەوە ئاگام لە ڕێگەوبان و ناو پاس نەمابوو هەر بۆیە مەوقیفەکەی نزیك ماڵ خۆمانم تێپەڕاندبوو لە ناکاو بەهۆی پێویستییەوە ڕۆشنکەرەوەی (گلۆپی) ناو پاسەکە هەڵبوویو منیش ڕاچڵەکیم کە تەماشام کرد بینیم پاسەکە لەو مەوقیفە تێپەڕیوە کە دەبوو من لێی دابەزم بۆیە

بەپەلە وتم "رەحمەت نەبێت لە پێشەوە دابەزین هەیە" ئیدی دابەزیم و بە پیادە بەرەو ماڵ گەڕامەوە لەو ڕێگەیەدا دەمویست ئەوە بە بیری خۆم بێنمەوە کە چۆن لە کاك حامید جیابوومەوە؟! لە کوێوە خۆم گەیاندە گەراجی پاسەکان؟! ئایا کرێی پاسم داوە یان نا؟! بەڵێ دەمویست بەبیری خۆمی بێنمەوە چۆن گەیشتوومەتە لای ماڵ، بەڵام تەنها ئەوەم بیر هاتەوە کە لە کاك حامید جیابوومەوە!

ئەو کاتەی من گەیشتمە ماڵەوە باوکم و دایکم نانیان خواردبوو، بەڵام سفرەکە هێشتا هەڵنەگیرابوو، دایکیشم دەیزانی ئەو شتەی کە لێیناوە من نایخۆم بۆیە کەمێك خورما و ڕۆنی بە جیا بۆ من دروست کردبوو، بە ڕاستی بەهۆی ئەوەی دەمێك بوو نەمخواردبوو زۆر بە تامەزرۆییەوە خواردم و تەواوم کرد.

هەر لەو شەوەوە بەپێی مەجال و توانا "بۆیە دەڵێم بەپێی مەجال و توانا، چونکە هەر ڕۆژێك بچوومایە بۆ کرێکاری شەوەکەی زۆر بەکەمی توانای خوێندنەوەم دەبوو" دەستمکرد بە خوێندنەوەی کتێبە بەرگ ڕەشەکە، ئەو کتێبە بۆ من زۆر شتی نەبیستراو و ئاڵۆز و جێی گومانی تێدا بوو، لە کاتی خوێندنەوەیدا جارجار دەموت "باشە مامۆستا ئەکرەم بۆ دەیوت ئەمە کتێبێکی باشە؟!" هەرچەندە کتێبەکە بۆ من بێزارکەر و قورس بوو، بەڵام لەبەر قسەکەی مامۆستا ئەکرەم نەمدەتوانی بە کتێبێکی خراپ و بێ نرخ سەیری بکەم، دەستم لە خوێندنەوەی هەڵگرت، بەڵام بە خۆمم وت "هەوڵ دەدەم لە داهاتوودا بیخوێنمەوە".

ڕۆژی هەینی بوو، لەبەرئەوەی بڕیار بوو ماموٚستا بۆ شەوەکەی تەنیا خۆی لە ماڵ بێت، بۆیە مەوعیدمان دانابوو لەگەڵ ماموٚستا، ئەگەر کارێکی گرنگم بۆ پێش نەیەت ئەوا من بچم بۆ ماڵ ماموٚستا و شەو لای ئەو بم.

پێش ئێوارە خوشکێکم هات بۆ ماڵمان، ئەم خوشکەم مێردەکەی دکتۆر بوو ئەو شەوانەی مێردەکەی لە نەخۆشخانە خەفەر دەبوو ئەم دەهات بۆ ماڵ ئێمە لەگەڵ منداڵەکانیدا کە دوو کوڕ و کچێکی هەبوو، بەڵام بە هۆی ئەوەی لەگەڵ ئەم خوشکەم زوورزوو یەکترمان دەبینی بۆیە ئاسایی بوو ئەگەر شەو بڕۆشتمایە بۆ ماڵ ماموٚستا ئەکرەم.

دوای نانخواردنی ئێوارە و نزیك بانگی خەوتنان بەڕێکەوتم بۆ ماڵی ماموٚستا ئەکرەم، بەڵام کە گەیشمە بەردەرگاکەیان چەند جارێك لە دەرگامدا کەس نەهات دەرگا بکاتەوە، بۆیە بە ناچاری کەمێك لە بەردەرگاکە چاوەڕێم کرد بەو ئومێدەی ماموٚستا

دەرکەوێت. ئیتر ئەوەبوو مامۆستا لە سووچی کۆڵانەکەی خۆیانەوە بەرەو ماڵ خۆیان هات کە گەیشتە لای من مەرحەبایی و هەواڵ پرسینی یەکترمان کردو، مامۆستا وتی:

خۆشحاڵ بووم ئیشێکی گرنگت بۆ پێش نەهات و هاتیت بۆ لای من.

منیش وتم: مامۆستا گیان ڕاستیەکەی خوشکێکم هات بۆ ماڵمان و ئەمشەویش لەوێ دەمێنێتەوە، بەڵام ئاساییە من ئەمشەو لە ماڵ نەبم.

مامۆستا وتی: ئەگەر منداڵی نەبێت قەیناکا، بەڵام ئەگەر منداڵی هەبێت دەبوو لایان بمایتایەتەوە.

وتم: دوو کوڕو کچێکی بچکۆلەی هەیە.

مامۆستا وتی: دەی بەهەرحاڵ، بەڵام شەهرام گیان خۆزگە لایان بمایتایەتەوە.

چووینە ژوورەوە، من دانیشتم و مامۆستا چوو بۆ ژوورەکەی ئەولا، کە ئەوەندەی بزانم مەتبەخەکەیان بوو، گەڕایەوە سینییەك کە چەقۆیەك و کاڵەکێك و بڕێك نانی لەسەربوو هێنای دایناو گەڕایەوە بۆ مەتبەخەکە سوراحییەك ئاو و دوو پەرداخی هێنا، وتی:

فەرموو شەهرام گیان با پێکەوە بیخۆین.

منیش دەستم برد بۆ سوراحییەکە و پەرداخێکم لە ئاو پڕکرد و فەرمووم لە مامۆستا کرد، وتی: نۆشی گیانت بێت تینوم نییە،

ئاوەکەم خواردەوە.

مامۆستا کاڵەکەکەی پاك دەکردو قاشی دەکرد لەوکاتەدا وتم چییە مامۆستا دەڵێی برسیت بووەتەوە یان ئێوارە کەمت خواردووە؟

مامۆستا وتی: شەهرام گیان من زۆرجار کە بۆ نوێژی ئێوارە دەچم بۆ مزگەوت ناگەڕێمەوە تا دوای نوێژی خەوتنان هەر بۆیە نانخواردنی ئێوارەم دەکەوێتە ئەم وەختانە، ئەم ئێوارەیەش لە مزگەوت مامەوە و نەگەڕامەوە تا دوای نوێژی خەوتنان.

ئیدی مامۆستا بە تەواوی کاڵەکەکەی پاك کردو قاشیشی کرد پاشان زیاتر سینییەکەشی لە من نزیکتر کردەوە و وتی: دەی ئێستا فەرموو کاکە شەهرام، منیش دوو قاشم خوارد و وتم: خودا نەیبڕێت مامۆستا گیان من هەر ئەوەندەم بۆ دەخورێت.

مامۆستا وتی: شەهرام گیان باوەڕ ناکەم تا ئێستا درکت بەوە نەکردبێت کە لە ماڵی ئێمەدا پێویست ناکات شەرم بکەیت.

منیش وتم: دڵنیابە مامۆستا گیان هەر ئەوەندەم بۆ دەخورێت و مەسەلەکە شەرم نییە.

مامۆستا وتی: زۆر باشە، مادام مەسەلەکە شەرم نییە، شەهرام گیان برۆ لەودیو "مەتبەخەکە" چایەك لێبنێ.

وتم: بەسەرچاو مامۆستا گیان.

هەستام چوومە مەتبەخەکە، بەڵام ئەو مەتبەخەی من چوومە ناوی هەر بەناو مەتبەخ بوو ئەگەرنا نە کەوانتەرێکی ساغی تیابوو

نە تەباخەکە بەو جۆرە بوو قاپ و قاچاخەکەش شتێکی وا نەبوو، بە خۆمم وت پێدەچێت تا ئێستا کەلوپەل و ناوماڵەکەیان لە لادێکە نەهێنابێتەوە، دواتر بە پرسیارکردن لە مامۆستا "چا"کەم دۆزییەوە، پاشان وتم لە کوێ ئاو بکەمە ناو قۆریەکە؟

مامۆستا وتی: شەهرام گیان دەبێت لە تەنکییەکان ئەوەی لای ڕاستی نزیك دەرگای حەوشە ئاوی تێبکەیت.

منیش چوومە لای تەنکییەکەو لەوێ ئاوم کردە قۆریەکە، کە گەڕامەوە مامۆستا وتی شەهرام گیان با چای کەم بێت، ئیدی قۆریەکەم خستە سەر چاوی لای چەپی تەباخە سێ چاوەکەو چووم لای مامۆستا دانیشتم، لەو کاتەدا مامۆستا لە خواردنی کاڵەکەکە تەواو بوو بۆیە هەستا ئەو چەند قاشە کاڵەکەی مابوویەوە بردیەوە بۆ مەتبەخەکەو توێکڵ و ناوکەکەشی برد خستییە ناو تەنەکەکەی نزیك دەرگای حەوشە، کاتێك لای دەرگای حەوشەکە بەرەو ژوورەوە دەگەڕایەوە وتی شەهرام گیان وەرە حەوشەکە بۆ دانیشتن خۆشترە ئیدی منیش هاتمە حەوشەکەو لەسەر کورسییەك دانیشتم، بەڵام مامۆستا بە بێدەنگی بۆ ماوەی چەند خولەکێك بە ناو حەوشەکەدا پیاسەی کرد دواتر هات لای من دانیشت، منیش پرسیم: مامۆستا کاك حامید دیار نییە دەڵێی پێت نەوتووە؟

مامۆستا وتی: بۆچی نا، پێموت، بەڵام غەزالی هەموو کات سەرقاڵە ئەگەرنا کاتێك پێموت، وتی باوەڕ بکە مامۆستا زۆرم حەز

دەکرد بێم بۆ لاتان و بیری کاك شەهرامیش دەکەم، بەڵام بڕیارە برادەرێکم بێت بۆ لام بۆیە من ناتوانم بێم بۆ لاتان، بەڵام ڕێز و سڵاوم بگەیەنە بە کاك شەهرام.

پاش کەمێك پێکەوە دانیشتن ماموٚستا وتی:

شەهرام گیان وابزانم بۆنی چاییەکە دێت، منیش بەپەلە چووم بەرەو مەتبەخەکە بینیم وا لە لولەی قۆریەکەوە چاییەکە قوڵپەی دێت ئەوەندە کوڵاوە، تەباخەکەم کوژاندەوە و لەسەر سینییەك پێویستیەکانی چا خواردنەوەکەم بردە حەوشە و لەگەڵ ماموٚستا بەدەم قسەکردنەوە چامان تێکرد و خواردمانەوە، لەم کاتەدا بە ماموٚستام وت ئەرێ ماموٚستا کەمێك بەر لە ئێستا کە چوومە ناو مەتبەخەکە بە جۆرێك مەتبەخەکەتانم کەوتە بەرچاو وای لێکردم بە خۆم بڵێم لەوانەیە ماموٚستا و خێزانی هەموو کەلوپەلەکانیان لە لادێکە نەهێنابێتەوە؟

ماموٚستا وتی:

شەهرام گیان ئەوەی تۆ لێرە دەیبینیت هەمان ئەو شتانەن لە لادێش هەمانبوون، هیچمان لە لادێ جێنەهێشتووەو هەموو شتەکانمان هێناوەتەوە. بۆچی ئەم قسەیەت کرد، مەگەر ماڵ و حاڵمان کەموکوڕی هەیە؟

وتم:

نەوەڵا ماموٚستا گیان بە قەناعەتی من هیچ کەموکوڕییەکی نییە بگرە لەوانەیە زیادیشی هەبێت، بەڵام هەرچی دەکەم ناتوانم لەوە

تێبگەم کە چۆن دادە باخانی خێزانت بەم ماڵ و حاڵەوە ڕازییە لەگەڵتدا بژی؟!

+ ئەی شەهرام گیان با من لە تۆ پرسیارێك بکەم.

_ فەرموو مامۆستا.

+ بۆچی تۆ قەناعەتت وایە ئەم ماڵە لێیشی زیادە، بەڵام بۆ ئافرەتێکی وەکو خێزانم پێت کەمەو لات سەیرە چۆن بەم حاڵەوە ئارامی گرتووە؟

_ ئاخر مامۆستا گیان سروشتی ئافرەت بەو جۆرەیە کە ئەوەی لایان گرنگەو جێی بایەخە بریتیە لە ناوماڵ و سەروەت و سامان و ئەو جۆرە شتانە.

+ کاکە شەهرام لەوانەیە قسەکەت ڕاستییەکی ڕێژەیی تێدا بێت واتە بەشێکی کەم لە قسەکەت ڕاستە، بەڵام ناتوانین ئەم قسەیە بە ڕاستییەکی ڕەها بزانین، ئەم قسەیەی تۆ بۆچوونی ئەو جۆرە کەسانەیە "هەرچەندە ئەو جۆرە مرۆڤانە شایەنی ئەوەیان نییە پێیان بوترێت کەس" بۆیە وا جوانترە بڵێم بۆچوونی ئەو جۆرە مرۆڤانەیە کە تەنها لەگەڵ دیوە مادییەکەی ئافرەت مامەڵە دەکەن ئیدی بێ ئەوەی هیچ حیسابێك بۆ خەیاڵ و ڕۆحی ئافرەت بکەن تەنانەت هەندێکجار ئەم جۆرە مرۆڤانە ئەوەندە سنورشکێنی دەکەن پێیان وایە ڕۆح و خەیاڵ دوو شتن لە پێکهاتە و بوونی ئافرەتدا وجودیان نییە، بەڵام ئەوە ئاژەڵەکانن بەو جۆرە تەماشای بەرامبەرەکانیان دەکەن هەرچەندە هەموو ئاژەڵەکانیش بەم

شێوەیە نین، بۆنمونە ئەگەر بە جوانی لە باڵندەیەکی وەکو کوکوختی ورد ببینەوە دەبینین بەم جۆرە مادییە لەگەڵ کوکوختییەکی دیکە مامەڵە ناکات، بۆیە ئەو بۆچوونەی پێی وایە ئافرەت مەخلوقێکە خاڵییە لە خەیاڵ و ڕۆح لە بۆچوونی مرۆڤێکی خاڵی لە خەیاڵ و ڕۆح زیاتر شتێکی دیکە نییە.

لەم وەختەدا تەقەی دەرگای حەوشەکەی ماڵ ماموستا هات، ماموستاش هەستا چوو دەرگاکەی کردەوە، بەڵام کەسێك بوو بە هەڵە دابووی لە دەرگای ماڵی ماموستا، بۆ ماڵێکی دیکە دەگەڕا.

دواتر ماموستا گەڕایەوە و دانیشت، وتی:

شەهرام گیان بمبورە بەو جۆرە قسەم کرد، بەڵام بەخودا زۆر ئەو قسانەم لا ناخۆشە کە تەڕ و وشك پێکەوە دەسووتێنێت، ئاخر ئەمڕۆ قسەی بەشێك لە پیاوەکان بووە بەوەی کە ئافرەت بە سەرچاوەی وێرانی و کاولکاریەکان لە قەڵەم دەدەن، بەڵام توخودا تۆ پێم بڵێ کامە جەنگی گەورەی کاولکاری و وێرانکاری ئافرەت هەڵیگیرساند؟ مەگەر سیاسییە درۆزنەکانی دونیا پیاو نین؟ دەی جەنگەکانیش هەر ئەو سیاسییە درۆزنانە بەرپایان کرد، ئەگەر دوعاو نزای دایکە دڵ پاکەکانی دونیا نەبوایە جەنگەکان هەر بەردەوام دەبوون، دەی مەگەر دایك ژن نییە؟ بەڵام هەموو ئەم قسانە و چەندین قسەی تریش ئەگەر بکرێن ناتوانن ببنە سەلمێنەری ئەو قسەیە کە بوترێت "ئافرەتەکان بێ خەوشترین مەخلوقی خودان" چونکە ئەوە قسەیەکی ڕاست نییە، نەك هەر بۆ

ئافرەت بەڵکو بە نیسبەت ڕەگەزی من و تۆیشەوە هەر قسەیەکی ناڕاستە، چونکە هەم ئافرەت و هەم پیاویش مادام مرۆڤن ناکرێت بێ خەوش و بێ هەڵە بن، بە هەرحاڵ شەهرام گیان با لەوە زیاتر بەم باسەوە سەرقاڵ نەبین ئەگەر پێویست بوو لە کاتی گونجاوتردا زیاتر قسەی لەسەر دەکەین.

پاش کەمێکی دیکە لە دانیشتن ماموٚستا پرسی:

تۆ باسی حاڵی خۆتم بۆ بکە شەهرام گیان، لەگەڵ خوێندنەوە و کتێبەکان پەیوەندیت چۆنە؟ چی دەخوێنیتەوە؟

_ ڕاستیەکەی ماموٚستا هەرچەندە شەوانە لەگەڵ وشە و ڕستەی ناو کتێبەکان دەبینە هاودەم وە هەندێ جاریش دەبینە دوژمنی یەك، بەڵام بەهۆی ماندووبوونی ڕۆژەوە لە ناو ئیش و کرێکاریدا شەوان تەنها نزیکەی کاتژمێرێك توانای هەڵدانەوەی لاپەڕەی کتێبەکانم هەیە جگە لەو شەوانەی کە ڕۆژەکەی ناچم بۆ ئیش، لەو شەوانەدا زۆر زیاتر لە کاتژمێرێك لە ڕێی چاوەکانمەوە گوێ بۆ نووسەرەکان دەگرم، ئەم چەند شەوەی پێشویش بە خوێندنەوەی ئەو کتێبەوە خەریك بووم کە ئەوجارە بە دەستمەوە بوو تۆ وتت ئەمە کتێبێکی زۆر باشە.

+ ئەی کتێبێکی چۆنە، پێت باشە؟

_ هەرچەندە تەواوم نەکردووە، بەڵام کتێبێکی زۆر قورسە و بابەتەکانی زۆر بە سەختی شتێکی کەمیان لێ تێدەگەم، بەهۆی کەمی توانای من و زۆری توانای نووسەرەکانی ناو ئەم کتێبە

ناچار بووم دەفتەرێکی تایبەت دابنێم بۆئەوەی لە کاتی خوێندنەوەیدا هەر نووسینێکی باش لێی حاڵی نەبووم لە دەفتەرەکەدا تۆماری بکەم، دواتر لە دەرفەتێکدا بیهێنمە خزمەتت تا زیاتر بۆم ڕوون بکەیتەوە و ئەو گرفتەی کە هەمە نەیهێڵیت.

+ شەهرام گیان ئەو شتە لە خەیاڵی خۆت بکەرە دەرەوە کە بتەوێت ببیت بە خوێنەری کتێبەکان و لە هەمان کاتیشدا مرۆیەکی بێ گرفت و بێ کێشە بیت.

_ مامۆستا بۆ من زۆر جێگەی سەرسوڕمانە تۆ ئەو قسەیە دەکەیت!

+ هەر بۆ تۆ نابێتە مایەی سەرسوڕمان، بەڵکو ئەگەر ئەم قسەیە لای زۆرێك لە خوێنەرەکانی دونیا بکرێت ئەوا بە هەمان شێوەی تۆ تووشی سەرسوڕمانیان دەکات، چونکە زۆربەی خوێنەرەکانی دونیا کتێب دەخوێننەوە بە نییەتی چارەسەر کردنی گرفتەکانی ڕۆژانەیان، بەڵێ زۆرێك لە خوێنەرەکانی دونیا کتێب دەخوێننەوە بە نییەتی کەمکردنەوەی ئازارەکانیان، زۆرێك لە خوێنەرەکانی دونیا وەکو ماددەی بێهۆشکەر لە کتێب دەڕوانن لە کاتێکدا کتێب هۆش و ژیری بۆ مرۆڤ دەگەڕێنێتەوە و خەیاڵ بۆ مرۆڤ دروست دەکات. بۆیە ڕاستییەك هەیە مرۆڤ ناتوانێت بڵێت نەخێر ئەوە ڕاست نییە، ئەو ڕاستییەش ئەوەیە بێ کێشەترین مرۆڤی دونیا ئەو مرۆڤەیە کە ناخوێنێتەوە، ئەو مرۆڤەیە کە دوورە لە کتێبەکان، ئەو مرۆڤەیە کتێبەکانی خۆشناوێت، ئاخر وەها مرۆڤێك وردە

ورده ژیری لەدەست دەدات و هێواش هێواش بە ئەندازەی دوورکەوتنەوەی لە کتێب لە هۆشمەندی دوور دەکەوێتەوە و بێهۆش دەبێت.

_ مامۆستا ئەوەندەی من لەم قسانەی تۆ تێبگەم دەتەوێت بڵێیت "ئەوانەی کتێبەکان ناخوێننەوە شێتن".

+ شەهرام گیان ئەگەر شێتی یەکسان بێت بە دووری لە ژیری وە یەکسان بێت بە بێهۆشی و بێئاگایی، بەڵێ ئەو قسەیەی تۆ کردت ڕاستە.

_ بەڵام مامۆستا هەرچەندە بیر دەکەمەوە ناتوانم بە هەموو ئەوانەی کتێب ناخوێننەوە بڵێم شێت، چونکە چەندەها مرۆڤ هەن هەرگیز کتێبێکیان نەخوێندووەتەوە، بەڵام ئێمە بە بەردەوامی سودیان لێ وەردەگرین بەهۆی کارەکانیانەوە.

+ کاکە شەهرام تۆ ڕاست دەکەیت کە دەڵێیت "چەندەها مرۆڤ هەن هەرگیز کتێبیشیان نەخوێندووەتەوە کەچی مایەی خێر و کەڵکێکی باشن بۆ کۆمەڵگە" لە ڕاستیدا ئەمانە خودی نووسەرەکانن، بەڵام ئەوە هەیە لەبری پێنوس و کاغەز بە کۆمەڵێك کەرەستەی دیکە پرۆسەی نووسین ئەنجام دەدەن، بۆنمونە (جووتیارێك لەبری کاغەزو لاپەڕە، زەوی هەیە، لەبری پێنوس و وشە، کێڵان و تۆوی هەیە، لە کۆتایدا لەبری ئەوەی کتێبێك بە ناوی گەنمەوە بڵاو بکاتەوە گەنمی ڕاستەقینە بڵاو دەکاتەوە). هەڵبەتە شەهرام گیان ئەمە تەنها نمونەیەکە.

_ کەواتە بەبێت بەو نییەتەی خۆم بڵێم خوداحافیز، مەبەستم ئەو نییەتەیە کە دەمەوێت خوێنەر بم بۆئەوەی بێ گرفت و بێ کێشە بم.

+ شەهرام گیان بە تەنها تۆ نا، بەڵکو دەبێت زۆرینەی خوێنەرەکانی دونیا بەو نییەتی خوێندنەوەیە بڵێن بڕۆ و جارێکی دیکە نەیەیتەوە، دەبێت خوێنەرەکان ئەو نییەتە تەڵاق بدەن، بەڵام ئەگەر چارەسەری دەردی سەری و کێشەکانیش بۆ ئەوە بێت کە مرۆڤ چێژو لەزەت لە ژیان ببات دەی ئەوا ئەو چێژ و لەززەتەی گرێدراوە بە ئازاری خوێندنەوە و خوێنەربوونەوە هیچ لەزەتێکی دیکەی ناگاتێ.

_ مامۆستا ئەکرەم هەرچەندە لە ناکاو و بەبێ هیچ ئامادەکارییەك کەوتینە ناو ئەم باس و خواسەوە، بەڵام چەند شتێکی زۆر ئاڵۆزت بۆ ڕوون کردمەوە کە پێشتر بەمشێوەیە لام ڕوون نەبوو.

+ بۆچی شەهرام گیان پێشتر چیت لا ڕوون نەبوو؟

_ ڕاستییەکەی لام ڕوون نەبوو بۆچی دەخوێنمەوە، هەرچەندە چەند جارێك ئەم پرسیارەم لە خۆم کردبوو وە هەموو جارەکانیش بۆ وەڵامدانەوەی چەند خاڵێکم ڕیز دەکرد و قەناعەتم بە خۆم دەکرد کە خوێندنەوە کارێکی باشە، بەڵام هەندێکجاریش ئەو بێزاری و بێ تاقەتیەی لە خوێندنەوەی کتێبەکاندا بۆم دروست دەبوو بەشێکی زۆری خەتای من و دەسەڵاتی منی تیا نەبوو،

بەڵکو هەمووی تاوانی نووسەرەکان و وەرگێڕەکان بوو.

+ شەهرام گیان ئەمڕۆ وەکو هەموو شتەکانی دیکە کتێبەکانیش باش و خراپی هەیە، زۆرجار کە کتێبێك دەخوێنیتەوە ئەوەندە نووسینێکی بەکەڵکە خوێنەر حەز دەکات ببێت بە نووسەر، بە پێچەوانەشەوە هەندێك کتێب کە دەیخوێنیتەوە نەك هەر نووسەر، بەڵکو لە خوێنەربوونی خۆیشت پەشیمانی، من برادەرێکم هەبوو بۆی گێڕامەوە کە جارێکیان کتێبێکی خوێندبوویەوە، بەڵام کتێبەکە ئەوەندە شتێکی بێ کەڵك و زیادە بوو تەواو ئەو برادەرەی بێزار کردبوو ئەوەندە بێزار دەیوت ئەگەر دەسەڵاتم هەبێت نایەڵم لاپەڕەکانی ئەم کتێبە تەنانەت پاقلە فرۆشەکانیش بەکاری بێنن. جا ئەوەندەی من تێبینیم کردبێت کتێبە باشەکان هی ئەو نووسەرانەن کە ناتوانن بەبێ چەند پرسیارێکی گەورە بژین واتە کتێبە باشەکان هی ئەو نووسەرانەن کە هەمیشە لە خۆیان پرسیار دەکەن "چی بنووسم؟ چۆن بنووسم؟ ئەسڵەن ئەوەی من دەمەوێت بینووسم ئەگەر نەینووسم چی ڕوو دەدات؟" واتە لای نووسەرە باشەکان ئامانج بریتی نییە لە نووسین، بەڵکو بریتیە لە وەڵامدانەوەی ئەو چەند پرسیارەی کە ئەو نووسەرە دەیکات، واتە وەڵامدانەوەی "چی بنووسم؟ چۆن بنووسم؟ ..." جا کاکە شەهرام ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە لە نووسین بەرلەوەی لە کتێبە زەمینییەکاندا بوونی هەبێت لە کتێبە ئاسمانییەکاندا بوونی هەبووە و هەیە، واتە ئەگەر

لای خودا تەنها ئەوە گرنگ و مەبەست بووایە نووسراوێك و کتێبێك ڕەوانەی سەرزەوی بکات ئەوا لە سەردەمی پێغەمبەر موسادا قورئانی نازڵ دەکردە سەرزەوی و لە سەردەمی پێغەمبەر موحەمەدیشدا تەوراتی نازڵ دەکرد.

بۆ نووسەرێك چەندە واجبە بەرلەوەی دەست بکات بە نووسین دەبێت وەڵامی ئەو چەند پرسیارە بداتەوە کە پێشتر وتمان، ئەوا بۆ خوێنەرێکیش ئەوەندە واجبە پێش خوێندنەوە وەڵامی چەند پرسیارێك بداتەوە "چی بخوێنمەوە؟ بۆچی بخوێنمەوە؟ ..." بەڵام کاکە شەهرام لەوانەیە ئێستە تۆ بپرسیت "خوێنەر چۆن بتوانێت وەڵامی پرسیاری چی بخوێنمەوە بداتەوە هەتاوەکو کتێبەکان نەخوێنێتەوە؟" هەڵبەتە ئەمە پرسیارێکی بەجێیە. بەڵام بۆئەوەی خوێنەر پێش خوێندنەوەی کتێبەکان بۆی کەشف ببێت چ کتێبێك شایەنی خوێندنەوەی هەیە، چەند شتێك هەن کە لەم ڕوانگەیەوە دەبنە یارمەتیدەر بۆی، یەکێك لەو یارمەتیدەرانە ئەوەیە بە ڕێگەیەك لە ڕێگەکان ئەگەر شتێکی زۆر کەمیش بێت لە مێژووی نووسەرەکان ئاگادار بێت، یاخود خوێنەر دەتوانێت کەڵك لە یەکێکی دیکە لە یارمەتیدەرەکان وەربگرێت کە ئەمەیان بە ڕادەیەکی زۆر باش یارمەتی خوێنەر دەدات، ئەویش ئەوەیە خوێنەر بتوانێت کەڵك لە ئەزموونی ئەو خوێنەرانە وەربگرێت کە بە بەردەوامی دەخوێننەوە، واتە لەو خوێنەرانەی دیکە کەڵك وەربگرێت کە لەڕووی تەمەنی خوێندنەوەوە لە خۆی بە

تەمەنترن، ئەویش بەوەی بەر لە خوێندنەوەی کتێبەکان پرسیاری چۆنێتی ئەو کتێبانەی لێ بکات، هەروەها خوێنەر دەتوانێت بۆ هەڵسەنگاندنی کتێبەکان بە وردی سەیری پێڕستەکانیان بکات و چەند دەقێکی کورتیشیان لێ بخوێنێتەوە.

لەم کاتەدا بوو دەنگی ویقە ویقی ئۆتۆمبێلی فریاکەوتنی تایبەت بە نەخۆشخانە مامۆستا ئەکرەمی لە قسەکردن وەستاند، پاش چەند چرکەیەك مامۆستا زۆر بە لەسەرخۆیی و بە ئارامی و بە موحتاجییەوە چاوەکانی ڕوو بە ئاسمان هەڵبڕی و وتی "یا شافی" ئەو نەخۆشە هەر کەسێکە لە شیفای خۆت بێبەشی مەکە و ئیمانێکی دامەزراوی پێ عەتا بکە، منیش بە دەنگێکی نزمەوە لەبەرخۆمەوە ئامینێکم وت.

پاش کەمێك لە بێدەنگی مامۆستا وتی شەهرام گیان دەی تۆ شتێك بڵێ، لەو کاتەوەی دانیشتووین ئەوەندە بە شەوق و تامەزرۆیی و بە خۆشییەوە دیقەت لە ڕوخسارم دەدەیت و گوێت بۆ قسەکانم ڕاگرتووە بەردەوام هانم دەدەیت قسە بکەم.

_ مامۆستا گیان من شتێکم نییە بۆ وتن تەنها ئەوەندە نەبێت کە تکات لێدەکەم بەردەوامی بدە بەو قسانەی کە دەنگی ویقەی ئۆتۆمبیلەکەی نەخۆشخانە پێی بڕیت، ئەوەی ئەمشەو لەم چەند خولەکەدا تۆ دەربارەی نووسەرەکان بە منت وت خودی نووسەرەکان ماوەیەکی زۆرە نەیانتوانیوە بە منی بڵێن، ئەوەی لە زمانی تۆوە دەربارەی کتێبەکان گەیشت بە گوێکانی من تا ئێستا

لەناو کتێبەکاندا چاوی من پێیان ئاشنا نەبووە، ئەو واجبەی کە وتت دەبێت لە خوێنەرەکاندا هەبێت منی خوێنەر تا ئەمشەو حسابی سوننەتیشم بۆ نەکردبوو، بۆیە تکا دەکەم لە قسەکانت بەردەوامبە.

+ جارێ شەهرام گیان با بچم سوراحییەك ئاو بێنم.

مامۆستا گەڕایەوە و سوراحییەك ئاو و نەختێك ترێ ڕەشەی هێنا، دوای خواردنی ترێکە و خواردنەوەی دوو پەرداخ لە ئاوەکە لە لایەن هەردووکمانەوە، مامۆستا وتی:

بەدەستهێنانی سەرکەوتن لە پرۆسەی خوێندنەوەدا بە تەنها کاری خوێنەر نییە، خوێنەر بۆئەوەی بە پەیژەی خوێندنەوەدا سەربکەوێت بۆ سەر سەربانی سەربەرزی و سەرکەوتن، دەبێت بزانێت قاچەکانی دەخاتە کوێی پلەکانی پەیژەکە، بەڵام خۆ دەبێت پلەکانی ئەم پەیژەیەش مەحکەم بن، واتە دەبێت نووسەرەکان هەمیشە لە کاتی نووسیندا ئەوە لە یاد نەکەن کە نووسین بریتیە لە دەستگرتنی خوێنەر بۆ پەڕینەوە لە چاڵە پڕ لە گومانەکانی فیکر بۆ سەر بەرزاییە یەقینییەکانی ڕۆح و جوانی.

شەهرام گیان تۆ تکای ئەوەت لە من کرد کە لە قسەکانم بەردەوام بم، منیش لە خودا داوا دەکەم یارمەتیدەرت بێت وە لە خۆیشت داوا دەکەم تێبکۆشیت و هەوڵبدەیت.

_ هەوڵی من و یارمەتی خودا بۆ چ شتێك مامۆستا گیان؟

+ بۆئەوەی نەکەویتە ناو ئەو تاقمە خوێنەر و ڕەخنەگرانەی کە

لە هەموو سەردەمێکدا سەرهەڵدەدەن، ئەمڕۆش گروپێك لە خوێنەر سەریهەڵداوە لە پێش نووسەرەکانەوە کتێبەکان تەواو دەکەن! جاری وا هەیە کتێبێکی چەند بەرگی لە سەرەتاوە بەرگی یەکەمی بڵاو دەبێتەوە ئیدی ئەم جۆرە خوێنەرانە کە تەنانەت بەرگی یەکەمەکەش بە جوانی ناخوێننەوە، بەڵام هەر بەم خوێندنەوە ساوایەوە وەها ئەم کتێبە و بەرگەکانی دیکەشی کە هێشتا نووسەر تەواوی نەکردوون دەدەنە بەر ڕەخنە و قسەی نابەجێ کە هێندەی زیانی سەرکردە و سیاسییە درۆزنەکان بۆ کۆمەڵگە زیان بە دونیای کتێب و پەیوەندی نێوان نووسەر و خوێنەر دەگەیەنێت.

خوێندنەوەی دەقەکان یاخود خوێندنەوەی کتێبەکان مافی هەر کەسێکە، بەڵام لێکدانەوە و تەفسیرکردن و پیاهەڵدان و ڕەخنەگرتن لە هەر دەقێك بە تەنها مافی خوێنەری ئەو دەقە یان ئەو کتێبەیە، بۆیە ئەو خوێنەرەی پێشوەخت بەبێ خوێندنەوە و بە ڕای ئامادەکراوەوە هەوڵی کوشتنی دەقێك دەدات ئەوا بەهۆی مەرگی خۆیەوە فریای ئەوە ناکەوێت ئەو مەرگەی کە ئەم بۆ ئەو دەقە بڕیاریداوە ببینێت، واتە بەر لە کوشتنی دەق خۆی کوشتووە، چونکە چەندین کتێب یاخود چەندین دەق هەن جارێکی دیکە زیندوویی و ژیان بۆ فیکر دەگەڕێننەوە، فیکر لە مەرگ ڕزگار دەکەن، بۆیە دەبێت ئەم جۆرە خوێنەرانە لە خەوی ئایدۆلۆژیا بەخەبەر بێنەوە چونکە خەوی ئایدۆلۆژیا لە مەرگی

"فیکرو خەیاڵ"ی خەوتووەکە زیاتر شتێکی دیکە نییە. بەڵێ گشت دەقێك لەوە گەورەترە بە بێ خوێندنەوە بتوانیت بڕیاری لەسەر بدەیت.

_ مامۆستا ئەگەر پزیشکێك چارەسەرێکی درێژخایەن بۆ نەخۆشێك دابنێت ئەوا بۆئەوەی لێهاتوویی و توانای ئەو پزیشکە بۆ نەخۆشەکە دەربکەوێت دەبێت نەخۆشەکە بە جوانی و بە وریاییەوە تا کۆتایی ئەو دەوا و دەرمانە بەکار بهێنێت.

+ ئەم نمونەیەی تۆ ئەو پۆشاکەیە کە رێك بە قیاسی قەدوباڵای قسەکانی مندا دووراوە. شەهرام گیان بیرم دێت بە منداڵی کەم ئێوارە هەبووە باوکم لێی نەدابم، باوکم بەیانیان دەچوو بۆ ئیش و ئێواران دەگەڕایەوە، منیش وەکو هەر منداڵێکی دیکە لە گەڕەك یاریم دەکرد و هەندێکجار شەڕم بە هەندێك لە منداڵەکان دەفرۆشت و زۆرجاریش منداڵەکان شەڕیان لەگەڵ من دەکرد و باشیشیان لێدەدام، بەڵام چ من هۆکاری دروستکردنی شەڕ بوومایە چ منداڵەکانی دی ئەوا ئێواران بەدەستی باوکم دەبوایە لێدانم بخواردایە، جا ئەم لێدانەی ئێواران لەبەر چی بوو؟ لەبەرئەوە بوو کە دایکم دەیوت ئەمڕۆ ئەکرەم شەڕی کردووە، یان جگە لە دایکم پیاوێکی هاوسێمان هەبوو زۆر ئێوارە لە سوچی کۆڵانەکە چاوەڕێی دەکرد تا باوکم لە ئیش بگەڕێتەوە و لەبری بەخێرهاتنەوەی پێی بڵێت ئەمڕۆ ئەکرەم لە سامانی کوڕمی داوە، بەڵام هەم هەندێك لەو شەڕانەی کە دایکم دەیوت وە هەموو ئەو

شەڕانەی کە باوکی سامان دەیوت "ئەمڕۆ ئەکرەم لە سامانی داوە" هیچ خەتایەکی منی تیا نەبوو، بەڵام چارم نەبوو هەر دەبوو بەدەستی باوکم لێدانم بخواردایە چونکە باوکم بە تەنها گوێی بۆ دایکم و بۆ باوکی سامان دەگرت هیچ گوێگرتنێکی بۆ من نەبوو. بەڵام تووشی سەرسوڕمانێکی زۆر بووم ئەو ئێوارەیەی کە باوکم لە ئیش گەڕایەوە بە توندی دەرگای حەوشەکەی داخست و لەبەرخۆیەوە دەیوت "ئەرێ نەبڕایەوە، عەیب ناکەیت پیاو، ئەوانە منداڵن و شەڕ دەکەن... لەم جۆرە قسانە" دایکم لەو کاتەدا وەکو هەموو ڕۆژەکانی دیکە بەپیری باوکمەوە دەچوو بۆ بەخێرهاتنەوەی، پاش بەخێرهاتنەوەی وتی ئەوە چییە باوکی ئەکرەم چی ڕوویداوە؟

باوکیشم وتی: جا بۆ لەم کاتەی ئێوارەدا غەیری باوکی سامان هیچ ڕووداوێکی تر هەیە، دووبارە وەکو هەموو ڕۆژەکانی تر لە بەردەمم ڕاست بوویەوە و دەڵێت ئەمڕۆ ئەکرەم لە سامانی داوە.

ئیتر ئەوە بوو باوکم بانگی منی کرد منیش وەکو هەموو ڕۆژانی پێشوو بە ترسەوە چوومە بەردەم باوکم، بەڵام ئەو دەستەی ئێوارانی ڕابردوو بە نییەتی لێدانی زللە دەیهێنا بۆ ڕوخسارم و زللەی لێدەدام ئەم ئێوارەیە بەو جۆرە نەبوو، بەڵکو لەبری یەك دەست بۆ زللە هەردوو دەستی بە نەرم و نیانی و پڕپڕ لە موحیببەتەوە هێنا بە سەر و ڕوخسارمداو خۆی نەوی کردەوەو ماچێکی کردم، پاشان وتی ڕۆڵەگیان بۆچی تۆ هەموو ڕۆژ کارێکی

وا دەکەیت کە باوکی سامان بێتە سەر ڕێم و بەو جۆرە بێتاقەتم بکات؟

منیش بە دڵێکی ترساوی ئامادەبوو بۆ گریان وتم باوکە بەو خودا گەورەیە ئەو شەڕانەی لەگەڵ سامان دەیکەم هیچی خەتای منی تیا نییە، بەڵام تۆ تەنها گوێ لە باوکی سامان دەگریت و هیچ گوێ بۆ قسەی من ناگریت وە هەموو جارێکیش لێم دەدەیت. ئیتر باوکم دەستیکرد بە گریان و جارێکی دیکە بەدەم خۆ نەویکردنەوە ماچێکی کردم و، وتی "ئەکرەم گیان توخودا گەردنی باوکت ئازاد بکە لە هەر لێدانێك کە بە ناحەق لێمداویت".

شەهرام گیان ئەمەی کە گێڕامەوە ئەگەر بە وردی دیقەتی بدەیت هاوشێوەییەك بوونی هەیە لە نێوان حاڵی باوکم و حاڵی ئەو جۆرە لە خوێنەر، واتە بەشێك لە خوێنەرەکان دوای قسەی ئەوانی دیکە دەکەون، هیچ گوێ بۆ خودی نووسەر ناگرن بەڵکو بە پشت بەستن بە قسەی ئەوانی دیکە بەردەوام لە نووسەر دەدەن، بەڵام لێدانێکی بە ناحەق! بۆیە دەبێت لە یەکێك لە ئێوارەکانی تەمەنی خوێندنەوەیاندا بە توندی دەرگای قسەی ئەوانی دی دابخەن و وەڵامی ئەو بەخێرهاتنەوەیە بدەنەوە کە ڕۆح و ویژدانی خۆیان لێیان دەکات وە دووبەدوو لەگەڵ نووسەردا دابنیشن گوێ بۆ تەواوی قسەکانی نووسەر بگرن تا بۆیان دەربکەوێت کە چەندین جار بە ناحەق لە نووسەریان داوە، ئیدی بارانی چاوەکانیان کاغەزی کتێبەکەی نووسەر تەڕ بکات و بە دەربڕینی

پەشیمانییەوە داوای گەردن ئازادی لە نووسەر بکەن.

کاکە شەهرام مەبەستی من لەوەی کە لە خودا داوای یارمەتی بۆت و لە خۆت داوای هەوڵدان دەکەم ئەوەیە تەنها بە قسەی ئەوانی دیکە کۆتایی پێ مەهێنە کە دەڵێن "بۆنی ئەم گوڵە خۆشە یان ناخۆشە، بەڵکو خۆت بۆنی بکە".

_ مامۆستا گیان وا هەست دەکەم زۆر باش لە قسەکانت حاڵی بووم، بەڵام زۆرجار خوێنەرەکان ئەوەڵ تا ئاخیری کتێبەکەش دەخوێننەوە دیسان بڕیارێکی عەقڵانی و دروست دەربارەی کتێبەکە نادەن یان وا چاکترە بڵێم ناتوانن هەڵسەنگاندنێکی دروست بۆ دەقەکانی ناو ئەو کتێبە بکەن، کە من بۆ خۆم یەکێکم لەو جۆرە خوێنەرانە.

+ دوو چەمك هەن ئەگەر بێتوو بە دیقەتەوە وەریان نەگرین یاخود ئەگەر نەتوانین لە یەکتریان جیابکەینەوە و هەردووکیان تێکەڵ بکەین و حسابی یەك چەمکییان بۆ بکەین ئەوا بە دڵنیاییەوە تووشی ئەو گرفتە دەبینەوە کە تۆ باست کرد، ئەو دوو چەمکەش بریتین لە (خوێندەوار) لەگەڵ (خوێنەر) ئەم دوو چەمکە هەریەکەیان مانای سەربەخۆی هەیە و جیاوازە لە مانای چەمکەکەی دیکە.

خوێندەوار ئەوەیە ئەگەر ئەم پیتانە (ئـ،ا،ز،ا،د،ی) پێکەوە بلکێندرێن ئەوا دەزانێت ئەم وشەیە بە (ئازادی) دەخوێندرێتەوە، ئەمە شتێکی ئاسانە و منداڵێکی پۆلی یەك یان دووی سەرەتایی

ئەم شتە دەزانێت و خوێندەوارە، تەنانەت هەندێکجار منداڵی وا هەیە ئەوەندە توانای بوون بە خوێندەواری زۆرە بەرلەوەی بچێتە قووتابخانە دەتوانێت کۆمەڵێك وشە و ڕستە بخوێنێتەوە، بەڵام ئایا بۆ ئەوەی خوێنەر بیت ئەوەندە کیفایەتە کە خوێندەوار بیت، بێگومان نەخێر، بۆیە هەر کاتێك تەنها بە نەفەسی خوێندەوارییەوە بچیتە خزمەتی کتێب وە نەفەس و تایبەتمەندی خوێنەری واز لێ بێنیت ئەوا جەوهەری پەیوەندی نێوان تۆ و دەق کۆتایی پێ دێت.

چۆن کاری نووسەر بریتیە لە داهێنان، کاری خوێنەریش بە هەمان شێوە بریتیە لە داهێنان، بەڵام داهێنانی خوێنەر بریتیە لە کەشفکردن یان دۆزینەوەی داهێنانەکانی نووسەر، بۆیە دەبێت خوێنەر لە ئان و ساتی خوێندنەوەدا وردبوونەوە و تێڕامانی هەبێت چونکە داهێنانەکانی نووسەریش بەرهەمی وردبوونەوە و تەئەمول و تێڕامانن. کەواتە هەموو خوێندەوارەکان خوێنەر نین، بەڵام هەموو خوێنەرەکان خوێندەوارن، کتێبە مەزنەکانیش پێویستیان بە خوێنەرە نەك خوێندەوار.

+ ئەرێ شەهرام گیان تۆ ماندوو نەبوویت لە گوێگرتن؟

_ مامۆستا باوەڕ بکە ئەمشەو خۆشترین شەوی ژیانمە، زۆر خۆش و بێ کێشە لە قسەکانیشت حاڵی دەبم وە ماندووش نیم، بەڵام ئەمجارە تکات لێ ناکەم بۆ بەردەوامیدان بە قسەکانت، بەڵکو دەڵێم ئەگەر توانات هەیەو بێتاقەت نەبوویت لە قسەکردن ئەوە زۆر

دڵخۆشم دەکەیت ئەگەر بەردەوام بیت.

+ خۆزگە تکات بکردایە، چونکە هەندێکجار دەکرێت تکا بۆ کردنی کارێك قبوڵ نەکرێت و ڕەت بکرێتەوە، بەڵام من هەرگیز ناتوانم کارێکی باش کە دڵی کەسێك خۆش بکات ئەنجامی نەدەم، بۆ مەسەلەی تاقەت و تواناش من بەم جەوە ڕاهاتووم، زۆر شەو لەگەڵ غەزالی تا درەنگێك دادەنیشین بەم شێوەیە باس و خواس دەکەین، بەڵام شەهرام گیان تۆ بڕۆ لە ناو سەلاجەکە هەندێك خورمای تیایە بیهێنە با تۆزێك خورماش بخۆین جا دواتر دەست دەکەینەوە بە قسەکانی خۆمان.

چووم خورماکەم هێنا و پێکەوە لەگەڵ مامۆستا لێمان خوارد پاشان مامۆستا بەمجۆرە دەستی کردەوە بە قسەکانی:

نووسەرێك چەندین دەق دەنووسێت تا لە ئەنجامدا نووسراوێك یاخود کتێبێکی لێ دێتە بەرهەم، هەردانەیەك لەم دەقانە بە مەبەستی بەخشینی مانایەك لەلایەن نووسەرەوە دەنووسرێت، بەڵام دەکرێت هەر ئەم دەقە لای خوێنەرێك مانایەکی جیاواز لەوەی نووسەری هەبێت بۆیە ئەوە بە تەواوی ڕاستە کە "تەنها نووسەری دەق خاوەنی دەقەکەیە، بەڵام بە ئەندازەی ژمارەی خوێنەرەکانی مانای هەیە" وە دەگونجێت خوێنەر مانای وا لە دەقدا کەشف بکات کە تا ئەو ساتەش نووسەر بۆ خۆی پەی بەو مانایە نەبردووە، لێرەوەیە دەکرێت جارێکی دیکە نووسەر ببێتەوە بە خوێنەری خوێنەرەکەی خۆی، کەواتە نابێت نووسەر

بێباك بێت بەرامبەر بە خوێنەرەکانی، ئەسڵەن نووسەر بوونی نابێت ئەگەر خوێنەر بوونی نەبێت وەك چۆن بوونی خوێنەریش نامومکینە بەبێ بوونی نووسەر.

جا بۆئەوەی خوێنەر جارێکی دیکە نووسەر بکاتەوە بە خوێنەری خۆی دەبێت خوێنەر بێت نەك خوێندەوار واتە وەکو پێشتریش ئاماژەم بۆ کرد دەبێت بە هەناسەی خوێنەرییەوە بچێتە خزمەتی دەق نەك وەك خوێندەوارێك، پیاوێکی گەورە هەیە لە کتێبێکیدا دەقێکی کورتی نووسیوە، دەڵێت "جاران قووتابیەکان فێری تێڕامان دەکران، بەڵام ئێستا قووتابیەکان فێری تەماشاکردن دەکرێن" جا فەلسەفەی بوون بە فەیلەسوف و فەلسەفەی بوون بە عارف لەم قسەیەی ئەم پیاوەدایە واتە فەیلەسوفەکان و عارفەکان لە ئەنجامی تێڕامانەوە دروست بوون، کە زیاتر لای عارفەکان چەمکی تێڕامان بە تەئەمول ناوبراوە. هەروەها ئەم قسەیە زۆر بە کورتی و بە پوختی (خوێنەر) و (خوێندەوار)یشی بۆ پێناسە کردووین، کە ئیشی خوێنەر بریتیە لە تێڕامان لە دەق کە ئەمەیان بە زمانی فەیلەسوفەکانە خۆ ئەگەر بە زمانی عارفەکان بیڵێین ئیشی خوێنەر بریتیە لە تەئەمول کردن لەگەڵ دەق، بەڵام خوێندەوار تەماشای دەق دەکات، جا لەبەرئەوەی ئیشی خوێندەوار تەنها تەماشاکردنە ئەوا نەك بە دوو چاو، بەڵکو بە تەنها چاوێکیش ئەنجامدەدرێت، بەڵام خوێنەری پێویستی بە هەموو وجودی خوێنەرەکە هەیە هەروەك چۆن بوون بە

نووسەریش پێویستی بە هەموو وجودی نووسەرەکە هەیە.

ئەوکاتەی خوێنەر لەگەڵ دەقدا مامەڵە دەکات دەبێت تێڕامان ئەو هۆشیاریەی بۆ دروست بکات کە وشەکانی ناو دەق هەرچەندە لە ڕووی شێوە و فۆرمیشەوە هاوشێوەی ئەو وشانە بن کە ڕۆژانە بەکاریان دێنین ئەوا لە ڕووی ناوەڕۆك و ماناوە جیاوازن، واتە کاتێك نووسەر لە دەقێکدا وشەی "بەرد" بەکاردێنێت پێدەچێت لە ڕووی ماناوە مەبەستی هەمان ئەو بەردە نەبێت کە ڕۆژانە لە قسەکانماندا بەکاری دێنین، بۆنموونە ئەگەر سەیر بکەین خودا لە قورئاندا دەفەرموێت (جَنَّاتُ عَدْنٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ) ئەگەر سەرنج بدەین دەبینین لەم دەقەدا وشەکانی (باخ، باخات، کۆشك، ئاو، ...) بەکارهێنراوە، مەگەر ئەمانە هەر ئەو وشانە نین کە من و تۆ و خەڵکی ڕۆژانە بەکاریان دێنین، بەڵێ بە دڵنیاییەوە هەر هەمان ئەو وشانەن، هەر بۆیە کە ئەم ئایەتە دەخوێنینەوە ڕاستەوخۆ خەیاڵمان دەچێت بۆ ئەو شوێنانەی لەسەر زەوین و هاوشێوەی وەسفی ئایەتەکەن، بۆنموونە خەیاڵمان دەچێت بۆ ئەو لادێیەی بۆ ماوەی چەندین ساڵ لەوێ مامۆستایم کرد، ئاخر لەوێش باخ و باخات هەبوو، بینا و خانوو هەبوو، ئاوی چەمەکە بە ناو باخەکاندا دەهات و بە تەنیشت ئاوایدا تێدەپەڕی، واتە ئەو شکڵەی لە لادێکە هەبوو بە تەواوی هاوشێوەی وەسفی ئایەتەکەیە، بەڵام هەر خودا خۆی دەفەرموێت (بەهەشتەکەی من نە

وێنەی هەیە لە دونیادا نە بەخەیاڵی کەسیشدا هاتووە) واتە لەم کتێبە ئاسمانییەدا وشەکان لەڕووی شێوە و ڕوخسارەوە هاوشێوە و هاوڕوخساری وشەکانی سەر زمانی مرۆڤن بەلاّم ناوەڕۆك و واتا و جەوهەرەکەی زۆر جیاوازە، تەنانەت مانای زۆربەی وشەکانی ئەوەندە دوورە لە مانای هەمان وشەی سەرزاری ئێمە کە هەندێکجار هەر بە خەیاڵیشماندا نایەت.

جا دەقی ناو کتێبەکان واتە ئەو دەقانەی نووسەرەکان دەیاننووسن و دەیانڵێن بەشێك لەم سیفەتەیان تێدایە بە تایبەت دەقە ئەدەبیەکان، واتە ئەوکاتەی نووسەرێك یان ئەدیبێك یان شاعیرێك دەقێك دەنووسێت هەمان ئەو وشانە بەکاردێنێت کە من و تۆ ڕۆژانە بەکاریان دێنین، بەلاّم ئەو لە بەکارهێنانیدا مامەڵەیەکی دیکەی لەگەڵدا دەکات، هەر بەهۆی ئەم جیاواز مامەڵەکردنەوە نووسەر دەبێت بە داهێنەر، داهێنانەکەشی بریتیە لە پێدانی مانای دیکە بە وشەکان، ئەگەر بە وردی دیوانە شیعریەکان یان ڕۆمانەکان بخوێنیتەوە دەبینیت هەمان وشەکانی ڕۆژانەی سەرزاری خەڵك دەقەکانی ناو ئەو کتێبانەیان پێکهێناوە، بەلاّم ئەوەی جیاوازە ئەوەیە مانای دیکە دراوە بە وشەکان بۆنمونە لای شاعیرێکی وەکو مەحوی وشەکانی "چوونە سەردار" دەبینیت، بەلاّم ئەمە مەبەست لە چوونە سەرداری ناو باخەکان نییە بۆ لێکردنەوەی میوە و ئەو جۆرە شتانە، بەڵکو ئەم شاعیرە هاتووە بە چەند وشەیەك مێژووی پڕ لە شکۆمەندی و سەربەرزی

"مەنصوری حەللاج" دەگێڕێتەوە، شەهرام گیان ئەم مەنصوری حەللاجە پیاوێك بوو بەهۆی عاشقبوون و حوکمی دین فرۆشەکانەوە کرا بە دارا.

لای هەر مرۆڤێك لەوانەیە "سپی" بریتی بێت لە ئەلوان لە ڕەنگ، بەڵام لای نووسەر سپی بریتیە لە "ڕەمز" لای نووسەر سپی ڕەمزە بۆ ئاشتی بۆیە لە زۆر شوێندا نووسەر و وێنەکێش هەمان کار دەکەن، بەڵام کاری وێنەکێش لەبری ئەوەی لەگەڵ وشە بێت لەگەڵ ڕەنگە واتە کاتێك وێنەکێشێك ڕەنگەکان لە وێنەیەکدا تێکەڵ دەکات مەبەستی ئەوە نییە تەنها ڕەنگەکان نیشانی تۆ بدات، بەڵکو دەیەوێت ئەو مانایەی بەهۆی ڕەنگەکانەوە خوڵقاندوویەتی نیشانی بدات. کەواتە دەبێت خوێنەر بەهۆی تێڕامانەوە فێر ببێت کە چۆن لەگەڵ دەقەکان و وشەکانی نووسەردا مامەڵە بکات چونکە ڕاستە وشەکان هەمان وشەکانی سەرزاری مرۆڤەکانی نێو بازاڕ و نێو گەڕەکن، بەڵام ئەمجارەیان لە قەڵەمی نووسەر بەربوونەتەوە.

_ هەرچەندە تا ئێستا بەو جۆرەی کە تۆ ئەمشەو بۆت باسکردم من لەگەڵ کتێبەکاندا مامەڵەم نەکردووە، بەڵام وا گومان دەبەم کۆمەڵێك کتێب هەن ئەگەر بەمجۆرەش کە تۆ باستکرد بیانخوێنیتەوە هێشتا شتێکی وات لێیان چنگ ناکەوێت یان دەتوانم بڵێم هەندێك کتێب هەن شایەنی ئەو جۆرە خوێندنەوەیە نین.

+ شەهرام گیان پێش ئێستا ئەوەم وت کە کاری خوێنەر بریتیە لە تێڕامان نەك تەماشاکردن، واتە خوێنەر دەبێت لەگەڵ دەقدا خۆی هیلاك بکات تا جارێکی تر ئەوەی نووسەر کەشفی کردووە خوێنەریش پەی پێ بباتەوە، خۆ ئەگەر خوێنەر بەم شێوەیەی کرد و، بەڵام دەرئەنجام ئەو دەقە هەر شتێکی سادەو بێ بەرهەم و بێ جەوهەر بوو واتە دەقێك بوو خاڵی بوو لە داهێنان ئەوا خوێنەر مافی خۆیەتی بە خۆی بڵێت لە ڕاستیدا ئەم کتێبە شایەنی خوێندنەوەی نەبوو، دەبێت ئێمەی خوێنەر ئەوەمان لەیاد بێت کە گشت دەقەکان لە توانایاندا نییە تاسەر بە زیندوویی بمێننەوە، بەڵکو "دەقی وامان هەیە هەر لە سەرەتاوە بە مردوویی لەدایك دەبێت" واتە چۆن مردوویەك بە تەنها ئێسك و پروسکێکی وشکەڵەیە و بەس، ئەمجۆرە دەقەش بە تەنها چەند پیتێکی مردووی وشکهەڵاتووی بێ ڕۆحە، جا مردوویەك بیبەیتە هەموو تاقیگە و بیمارستانەکانی دونیا ناتوانیت ڕۆح بکەیتەوە بەبەریدا بۆیە دەقێکیش کە بە مردوویی لەدایك دەبێت بیبەیتە لای گشت خوێنەرەکانی دونیا ناتوانن ڕۆح بکەنەوە بەبەریدا تەنانەت وەها دەقێك ئەگەری ئەوەی لێدەکرێت خوێنەریش بکوژێت.

جۆرێکی دیکەی دەقمان هەیە بە زیندوویی دێتە سەرپەڕە و کاغەزی کتێبەکان، بەڵام بەر لە مەرگی نووسەر مەرگ یەخەی پێدەگرێت و لە ناوی دەبات، لە ڕاستیدا وەها دەقێك لە ساتەوەختی نووسینیدا نووسەر زۆر بێبایەخانە لە زەمان و

مەکانی ڕوانیوە بۆیە دەقەکەشی تووشی دەردی بێ دەرمان دەبێت. بەڵام دەقی واشمان هەیە مردوو زیندوو دەکاتەوە، ڕۆح دەکاتەوە بەبەری ئەو خوێنەرانەدا کە ڕۆحیان ئۆغری کردووە، تەنانەت ئەمجۆرە دەقە مەرگی نووسەرەکەشی نابێتە هۆی مردنی، واتە نووسەر دەمرێت، بەڵام دەقەکەی هەر بە زیندوویی دەمێنێتەوە، ئەگەر لە دەقەکانی دیکەدا مەرگی دەق پێش مەرگی نووسەر بکەوێت ئەوا لەم جۆرەی دەقدا مەرگی نووسەر دەبینین، بەڵام دەقەکەی هەر بە زیندوویی دەمێنێتەوە، تەنانەت ئەوەندە زیندوو ئەگەر جارێکی دیکە نووسەرەکەیشی بیخوێنێتەوە ئەوا ڕۆح بەبەری ئەویشدا دەکاتەوە.

_ مامۆستا باست لە مەرگی دەق و مەرگی نووسەر کرد، ئەی مەرگی خوێنەر چی؟ چ کاتێك خوێنەر خوێنەربوونی خۆی لەدەست دەدات؟

مامۆستا پەرداخێك ئاوی خواردەوەو وتی:

ئەگەر خوێنەر لە پرۆسەی خوێندنەوەدا تەنها مامەڵەی لەگەڵ کتێبەکاندا بێت و تەواو، ئەوا مەرگی خوێنەریش نزیکە، چونکە نابێت پرۆسەی خوێندنەوە بە تەنها بریتی بێت لە خوێندنەوەی دێڕ و ڕستەی ناو کتێبەکان، بەڵکو خوێنەر دەبێت ببێتە خوێنەری هەموو ڕووداو و دیاردە و خالق و مەخلوقەکانی دەوروبەری، وە خوێنەر بە یەکجاری خوێنەربوونی خۆی لەدەست دەدات و وەفات دەکات ئەو وەختەی بە سەرلەقاندنەوە بۆ هەموو

دەقەکانی نووسەر دەڵێت "بەڵێ وایە!".

بۆئەوەی خوێنەر بە زیندوویی بمێنێتەوە و خوێنەربوونی خۆی لەدەست نەدات نابێت وشەکانی "نا، چۆن، بۆچی، ..." لەیاد بکات واتە لەو جێیەی کە پێویستە بە نووسەر بڵێت "نا" دەبێت ئەو "نا"یە بڵێت یاخود هەر دەقێکی نووسەر جێگەی پرسیارکردن بوو لە نووسەر ئەوا دەبێت خوێنەر ئەو پرسیارە بکات، بەڵام هەم وتنی نەخێر وە هەم پرسیارکردن لە نووسەر شوێن و کاتی خۆی هەیە نەك ئەوەی خوێنەر بڕیار بدات بۆ ئەوەڵ تا ئاخیری نووسەر هەر نەخێر بکات، وەها خوێنەرێك بریتیە لە دیکتاتۆر لە ژێر ناوی خوێنەردا.

لەو جێیەی کە بیر و بۆچوونەکان و سەرنجەکان ناوترێن ئەوا زەمەن و ڕووداوەکان وەك خۆیان بەردەوام دەبن و گۆڕانیان بەسەردا نایەت، ئەوەی بەشێك لە فەیلەسوف و بیرمەندەکان بە ئێمەیان پێشکەش کردووە بریتی نییە لە نووسین، بەڵکو بریتیە لە خوێندنەوەی ئەوان بۆ ئەو شتانەی لە سەردەمی ئەواندا گوزەراوە، دواتر ئەو خوێندنەوەیەی ئەوان بۆ ئێمە بووەتە نووسراو، لێرەوەیە کە نەترسان لە نووسەر دەبێت خوێنەر وەکو ئەرکێکی ناو پرۆسەی خوێندنەوە سەیری بکات چونکە ئەوکاتەی خوێنەر لە نووسەر دەترسێت ئەوە سەرقاڵی ئامادەکردنی دارەمەیتی خوێنەربوونی خۆیەتی.

وە ئەرکی خوێنەر بریتی نییە لە نەخوێندنەوەی ئەو شتەی

کۆمەڵگا پێی هەزم ناکرێت، بەڵکو دەبێت خوێنەر ئەو شتەی خۆی دەیەوێت بیخوێنێتەوە، چونکە کاری خوێنەر بریتی نییە لە رازیکردنی ئەوانی تر، بەڵکو خوێنەر عەودالّی کەشفکردنی حەقیقەتە، خوێنەر دەیەوێت ئەوە کەشف بکات کە کۆمەڵگا و ئەوانی دی نەیانتوانیوە کەشفی بکەن و پەی پێ بەرن، جا با ئەو کەشفکردنەی خوێنەر زۆریش "جیاواز" بێت لە نەفەس و حەز و خولیای ئەوانی دیکە، کە بەداخەوە شەهرام گیان ئەمڕۆ چەمکی جیاوازی بەهەڵە پێناسە دەکرێت کە دەوترێت "جیاوازی بریتیە لە سڕینەوەی ئەوی دی" لە کاتێکدا جیاوازی بە واتای "جۆرێکی تر" دێت، واتە هەبوونی ئەویش و هەبوونی ئەمیش نەك سڕینەوەی ئەوەیان و قبوڵکردنی ئەمەیان، هەروەك مامۆستای ڕەحمەتی ئەوەی وێنەکەیم لە ژووری کتێبخانەکەدا هەڵواسیوە مەبەستم مامۆستا "نوورسی"یە کە دەڵێت "بە تەنها ئەوەی لای من بریتی نییە لە هەموو حەقیقەت، بەڵکو ئەمەی منیش بەشێکە یاخود جۆرێکە لە حەقیقەت".

هەروەها پرۆسەی مەرگی خوێنەر لەوێشەوە دەست پێدەکات کە خوێنەر دەیەوێت یەك بەیەکی دەقەکانی نووسەر بکات بە کەوان و لە ڕێی ئەم کەوانەوە تیرەکانی خۆی بگرێتە نووسەر، خوێنەر سەرقاڵی خۆکوشتنە ئەو وەختەی بەبێ هیچ بنەمایەك وە بە شێوازێکی نالۆژیکیانە بە هەموو دێڕێکی نووسەر دەڵێت نەخێر، پێشتر ئەوەم وت کە خوێنەر نابێت ڕەخنە لە یاد بکات وە

هەندێکجار ڕەخنە نەك وەکو یەکێك لە مافەکانی خوێنەر دەبێت تەماشا بکرێت، بەڵکو ڕەخنە گەورەترین ئەرکی خوێنەرە، بەڵام ڕەخنە ئەگەر بۆ هەندێك لە خوێنەرەکان گەورەترین ئەرکیش بێت ئەوا بەشێکی دیکە لە خوێنەر هەیە تەنانەت مافی ڕەخنەگرتنیشی نییە، خوێنەرێك کە ڕەخنەگر نییە ئەو مافەی هەیە چەند پەڕەیەکی کتێبێك بخوێنێتەوە و ئیدی واز لەو کتێبە بهێنێت، بەڵام خوێنەرێکی ڕەخنەگر وەها مافێکی نییە چونکە ئەگەر بەر لە تەواوکردنی کتێبەکە دەست لە خوێندنەوەی هەڵبگرێت ئەوا دەبێت دەست لەوەش هەڵبگرێت کە ڕەخنە لە دەقەکانی ناو ئەو کتێبە بگرێت چونکە ئەو مافەی نەماوە.

شەهرام گیان هەرچەندە چەند جارێك چەمکی ڕەخنەگرتن و خوێنەری ڕەخنەگرم دەربڕی، بەڵام لە ڕاستیدا من بۆ خۆم لە پرۆسەی خوێندنەوەدا لەبری ڕەخنەگرتن لە دەق کارێکی دیکە دەکەم ئەویش پرسیارکردنە لە دەق، من ئەوە بە باشتر دەزانم کە خوێنەر ئەو وەختەی لەگەڵ دەقە فرە ڕەهەندەکانی نووسەردا ڕووبەڕوو دەبێتەوە ببێتە خوێنەرێکی پرسیارکەر نەك ڕەخنەگر، چونکە پرسیار هەمیشە ڕۆحی وەڵام دەخولقێنێت، بەڵام ڕەخنە لە سروشتیدا مەرگی ڕونکردنەوەی هەڵگرتووە.

_ مامۆستا من زۆرجار کە بە خوێندنەوەی کتێبێکەوە خەریکم، بەبێ ویستی خۆم ئەڕۆمە ئەو شارەی نووسەری لێ دەژی پاش چەند چارەکە سەعاتێك دەگەمە گەڕەکەکەیان دواتر لە گەنجێك

دەپرسم ئەویش ماڵی نووسەرەکەم پێ نیشان دەدات ئیدی دەڕۆم بەبێ لە دەرگادان خۆم دەکەم بە ژووری کتێبخانەکەی نووسەردا و لەسەر کورسییەك بەرامبەر بە نووسەر دادەنیشم... پاشان چەندین کاری دیکە، بەڵام کاتێك لەم خەیاڵاتە دێمە دەرەوە و تەماشای خۆم دەکەم دەبینم لە شوێنەکەی خۆم دانیشتووم و کتێبەکەی نووسەرم بە دەستەوەیە، زۆرجار دەربارەی ئەم پەیوەندییە خەیاڵی و ناواقیعیەی نێوان من و نووسەر "خوێنەر و نووسەر" پرسیار لە خۆم دەکەم، بەڵام ئەم پرسیارەش وەکو بەشێکی دیکە لە پرسیارەکان لە ناو ئەرشیفی زەینمدا بەبێ وەڵامی دەمێنێتەوە.

+ کاکە شەهرام هەرچەندە ئەم قسانەت خاڵی نەبوون لە خەیاڵی ئەدەبیانە و شاعیرانە، بەڵام بەشی کۆتایی قسەکانت بە جۆرێك پرسیار کردن بوو لە پەیوەندی نێوان "خوێنەر و نووسەر".

ئەوەی دەبێتە هۆکاری یەکەمی پەیوەندی نێوان خوێنەر و نووسەر بریتیە لە دەقەکەی نووسەر و ڕاڤەی خوێنەر واتە ناکرێت پەیوەندییەك لە نێوان خوێنەر و نووسەردا دروست ببێت ئەگەر دەقێك و خوێنەرێکی ڕاڤەکار بوونی نەبێت، بۆیە هەندێکجار دەبێت موفەسیرەکان دەربکەین و نەیەڵین دەست وەربدەنە پەیوەندی نێوان من و نووسەر "خوێنەرو نووسەر" نابێت لەبری من موفەسیرێك بێت ڕاڤە و تەفسیری دەق بکات، تەنانەت هەندێك لە دەقە دینییەکانیش، خۆ ئەگەر بە بوونی موفەسیریش لەو

نێوەندەدا قایل بووین ئەوا نابێت بەوە قایل ببین کە ئەو لێکدانەوەی ئەو بۆ دەقێك دەیکات بریتی بێت لە مانای ئەوەڵ و ئاخیری ئەو دەقە، خوێنەر نابێت تەنها بە خوێندنەوە واز لە دەق بێنێت چونکە خوێندنەوە تەنها بۆ ئەوەیە بزانێت نووسەر چی دەڵێت، ئیدی دوای ئەوەی زانی نووسەر چی دەڵێت دەبێت ڕاڤەیشی بکات، واتە بۆ ئەوەی پەیوەندییەك لە نێوان نووسەر و خوێنەردا بوونی هەبێت نابێت بە تەنها نووسەر قسە بکات، ئەگەر دەق بریتی بێت لە کردنی "سەلام"ێك لە لایەن نووسەرەوە بۆ خوێنەر ئەوا دەبێت خوێنەر بە هۆی ڕاڤەکردنەوە وەڵامی ئەو سەلامە بداتەوە.

_ ئیدی کە دیقەتی مامۆستا ئەکرەمم دەدا ڕوانینەکەم پێیدەوتم "بەسیکە شەهرام" لەوە زیاتر مامۆستا ماندوو مەکە، بۆیە وتم مامۆستا گیان لەوە زیاتر ماندووت ناکەم، هەرچەندە قسەکانی ئەمشەوی تۆ بۆ من وەك ئەو ئاوی بارانە وابوو کە لە ناکاو دەڕژێتە ژێر درەختێکی مردووی گەڵا زەردەوە و بۆ جارێکی دیکە ژیانی بەبەردا دەکاتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەو هەمووە باشیەی لە قسەکانی تۆدا هەبوون بۆ من، ناتوانم خۆم لەو ماندووبوونەی داهاتوو دوورە پەرێز بگرم کە بەهۆی گوێگرتن لە قسەکانی تۆوە بەرۆکم دەگرێت.

+ شەهرام گیان قسەکانی من ڕووبەڕووی چ ماندووبوونێکت دەکاتەوە؟

_ مامۆستا ئەمشەو کە تۆ باسی چۆنێتی خوێندنەوە و مامەڵەکردن لەگەڵ دەق و ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ نووسەر و ئەم بابەتانەت بۆ دەکردم، بە خۆمم وت دەبێت جارێکی دیکە سەرلەنوێ و دووبارە هەندێك لەو کتێبانە بخوێنمەوە کە پێشتر خوێندبوومنەوە، بۆیە وا هەست دەکەم خوێندنەوەی کتێبێك بۆ جاری دووەم خوێنەر ڕووبەڕووی ماندووبوونێکی زۆر دەکاتەوە.

پاش کەمێکی دیکە لە دانیشتنمان لە ناو حەوشەکەدا بە بێدەنگی و چاوهەڵبڕینمان بۆ ئاسمان، مامۆستا لە جێی خۆی هەستاو چوو بەرەو ژوورەوە دواتر گەڕایەوەو دوو کتێبی بە دەستەوە بوو، منیش یەکسەر وتم مامۆستا چییە وابزانم بە نیازی خوێندنەوەیت؟

مامۆستا وتی:

ئەم دوو کتێبە دوو دیوانە شیعری شاعیرێکی فارسە، من زۆر بە ئەستەم دەتوانم لە شەودا ئارام بگرم ئەگەر شیعر نەخوێنمەوە، ڕاستە ئێستە شەو درەنگی کردووە و نزیکین لە نیوەی شەو، بەڵام بۆ من وا پێویستە چەند شیعرێك بخوێنمەوە، تۆیش ئەگەر ماندوویت و خەوت دێ ئەوا ژووری تەنیشت کتێبخانەکە نوێن و شتی وای لێیە بڕۆ بیهێنە و کوێت پێ باشە لەوێ بخەوە.

_ نا جارێ نەختێکی دیکەش دادەنیشم، بەڵکو گوێمان لە شیعرێکی ئەو شاعیرەش بێت، دوای چەند خولەکێك کە بە بێدەنگ دانیشتبووین مامۆستا وتی گوێ بگرە شەهرام گیان، ئەم شاعیرە

لێرەدا چەند بە جوانی و بە موحتاجییەوە دەڵێت:

خودایە

نهێنی حەقیقەتی تۆ لای هیچ کەسێك ئاشکرا نییە

هیدایەتمان بدە

بۆ ئێمە ڕێیەکی باشتر لە هیدایەت بوونی نییە

یارەب لە ڕێگەی ڕاست نیشانەیەکم دەوێت

لە بادەی ئاو و گڵ گیانم دەوێت

لە بەخششەکانی خۆت بەهرەمەندم بکە

بۆ سوپاس گوزاریت زوبانێکم دەوێت

خودایە

بەهەشت بە بێ دیداری تۆ بەندیخانەیە و

بەندکراو بۆ بەندیخانە بردن، کاری کەریمان نییە

ئیدی دوای ئەو شەوە نەختە نەختە بە وریایی و وردییەکی تەواوەوە لە سەرەتاوە دەستم کردەوە بە خوێندنەوەی ئەو کتێبەی پێشتر دەمخوێندەوە و دەفتەرێکیشم بۆ تایبەت کردبوو "ئەو کتێبەی کە مامۆستا وتی کتێبێکی باشە" ئەوە بوو لە ماوەی دوو هەفتەدا بە وردی کتێبەکەم خوێندەوە، بەڵام لە کاتی خوێندنەوەیدا زووزوو پێنوسەکەم هەڵدەگرت و دەفتەرەکەم پێ ڕەش دەکردەوە بە نووسینی سەرنج و ئەو پرسیارانەی بۆم دروست دەبوون، شەوێکیان ئەوەندە تێکەڵاو بووبووم لەگەڵ

خوێندنەوەی کتێبەکەدا گوناهی درۆیەکم تووشی خۆم کرد ئەویش ئەو درۆیەی کە وەستای ئیشەکەم ئاگادار کردەوە بەیانی ناتوانم بێم بۆ ئیش، بەڵام کاتێك وەستا پرسی بۆچی شەهرام خۆ هیچ نەبووە؟ ئەی تۆ ئێوارە نەتوت بەیانی دێم بۆ ئیش؟

لە وەڵامی وەستایا وتم خەجاڵەت خۆم وەستا گیان سبەینێ ناتوانم بێم بۆ ئیش چونکە کەمێك نەخۆش و ناساغم، لە ڕاستیشدا لە گوێزی ساغ ساغتر بووم، بەڵام ئیتر حەزی خوێندنەوەی کتێبەکە ئەو درۆیەشی پێ کردم، ئاخر ئەگەر ڕاستییەکەیشم پێ بوتایە کە لەبەر کتێب خوێندنەوە نایەم بۆ ئیش ئەوا دڵنیا بووم ئیدی نەیدەبردم بۆ ئیش، بە هەرحاڵ هەرچۆنێك بوو بەیانی نەچووم بۆ ئیش بۆیە لە پاش نوێژی بەیانییەوە دەستمکردەوە بە خوێندنەوەی کتێبەکە و تا نێوانی بەیانی و نیوەڕۆ بە تاقەتێکی باش و زەوقێکی زۆرەوە لەگەڵی خەریك بووم، بەڵام تەنها لەگەڵ کتێبەکە نا، بەڵکو لەگەڵ دەفتەرەکەش، یەك دوو جار بە خۆمم دەوت ئەرێ شەهرام کەی تۆ جاران ئەوەندە بە وردی و زەوق و شەوقەوە لەگەڵ کتێب خەریك دەبوویت!

بەم جۆرە تا ماوەیەك لەگەڵ ئەم دوو کارە بەردەوام بووم بە ڕۆژ کرێکاری و بە شەویش خوێندنەوە، ئەوە هیچ لە خوێندنەوەی ئەو کتێبە تەواو بووم، بەڵام چاوەڕێم دەکرد دەرفەتێکم بۆ دروست ببێت و بچمە خزمەتی مامۆستا ئەکرەم، ویستی خودا وابوو ئەو

ماوەیە هەر دەرفەتێك بۆ من هەڵدەکەوت مامۆستا کارێکی گرنگی بۆ دروست دەبوو یاخود بە پێچەوانەوە بۆیە نزیکەی زیاتر لە مانگێك لەگەڵ مامۆستا یەکترمان نەبینی، بەڵام جاروبار خەبەری یەکترمان دەزانی، لەم ماوەیەدا من دوو کتێبی دیکەم خوێندەوە، بەڵام ئەوەی لەو کاتەدا بەلامەوە سەیر بوو ئەوەبوو ڕۆژانە حەزو شەوقم بۆ خوێندنەوەی کتێب بەردەوام لە ڕۆحمدا بڵاوەی دەکرد وە بە ئەندازەی بڵاوبوونەوەی ئەم حەزو شەوقە لە ڕۆحمدا بیری ئیش و پارەو کرێکاری لە عەقڵمدا دەسڕایەوە تا ئەوەی ڕۆژێکیان بڕیارمدا نەچمەوە بەلای کرێکاریدا، ئەوەبوو تا چەند ڕۆژێك بەبێ خەمی خەریکی خوێندنەوە بووم، بەڵام لە پاشاندا وردەوردە ڕۆژانە دەنگە دەنگ و هاوارێك لە ناخمدا دروست دەبوون، ئەو دەنگ و هاوارە بەمجۆرە بوون "شەهرام تاکەی بێکاری؟ ئەگەر ئەمڕۆ لەبەر خوێندنەوە بێکاری هەڵبژێریت ئەوا دەبێت سبەینێ بۆ کڕینی کتێبەکان کارێك بکەیت، بێکاری نابێتە دەوای ئەم دەردە بەڵکو بێکاری زیادکردنی دەردێکی دیکەیە" ئیتر ئەم قەلەقی و خەمخواردنە لە بێکاری جارێکی دیکە کەش و هەوای خوێندنەوەی لێ شێواندمەوە، لەم حاڵەدا بووم ڕۆژێك بە ڕێکەوت لەگەڵ غەزالی یەکترمان بینی دوای مەرحەبایکردن کەوتینە پرسینی هەواڵی یەکتر، منیش حاڵەکەی خۆم بە جۆرێك تێگەیاند غەزالیش بە جۆرێك دڵسۆزی خۆی بۆم نواند بەوەی بەڵێنی دا هەم نزای خێرم بۆ بکات وە هەم هەوڵم بۆ بدات کارێکی گونجاوم بۆ

بدۆزێتەوە، بە کردنی ئەو قسانە و هەندێك قسەی دیکە نزیکەی سێ چارەکێك پێکەوە بووین و دواتر لە یەکتری جیابووینەوە، پاش چەند ڕۆژێك مامۆستا ئەکرەم ئاگاداری کردمەوە کە پێویستە یەك ببینین.

لەو ڕۆژەدا کە دیاریمان کردبوو بۆ یەکتربینین لەگەڵ مامۆستا ئەکرەم، من خۆم گەیاندە بەردەرگای ماڵی مامۆستا دوای دووجار لەدەرگادان دادە باخانی خێزانی مامۆستا دەرگاکەی لێکردمەوە و بە ئەدەبێکی تەواو شەرمەزارکەرانەوە بەخێرهاتنی لێکردم تا گەیشتینە ژوورەوە، دادە باخان وتی فەرموو کاکە شەهرام مامۆستا لەم ژوورەیە "ژووری کتێبخانەکە" کاتێك چوومە ژوورەوە بینیم مامۆستا وا لە ناو جێگا کەوتووە و زۆر بێ هێز و لاواز و ناساغە، بەپەلە و بە پەشۆکاوییەوە چووم بەرەو لای مامۆستا و لە لایەوە دانیشتم، مەرحەبایی یەکمان کرد و منیش ماچێکی نێوچاوانی مامۆستام کرد، ئیتر هێواش هێواش کەوتمە هەواڵپرسین و پرسیارکردن لەوەی مامۆستا خێرە چیت بەسەر هاتووە؟

مامۆستاش بە هێواشی و بە لاوازییەوە وتی:

سوپاس بۆ خودا خێرە ئەوەتا خودا ماوەماوە بەسەرم دەکاتەوە و بەخشندەیی خۆیم دووبارە نیشان دەداتەوە و نیعمەتم بەسەردا دەبارێنێت.

دادە باخان بە سوراحییەك ئاو و دوو پەرداخەوە هاتەوە بۆ

لامان و جارێکی تر بەخێرهاتنی منی کردەوە منیش لەگەڵ وەڵامدانەوەیدا وتم دادە باخان مامۆستا چییەتی بۆ خەبەرتان بە من نەداوە؟

دادە باخان وتی کاکە شەهرام ئەوە لە مامۆستا خۆی بپرسە.

مامۆستاش وتی:

باخان گیان لە منی پرسی منیش وەڵامم دایەوە، بەڵام دیارە شەهرام گیان بە وەڵامەکەی من زۆر باوەڕی نەبوو.

ئیتر دادە باخان وتی:

ئەوە نزیکەی بیست ڕۆژە مامۆستا بەم حاڵەوە لە ماڵەوەیە و زۆربەی کاتەکان بەمشێوەیە لە جێگادا کەوتووە، ئەم ناساغیەشی ئازارێکە لە پشتیدا، بە قسەی مامۆستا خۆی چەند ساڵ جارێك ئەم ئازارە سەرهەڵدەدات، بۆ ئەوەیش کە تۆمان لەبەرچی ئاگادار نەکردووەتەوە لەبەرئەوە بوو هەمیشە لە کاتی نەخۆشیدا مامۆستا هەوڵیداوە و نەیهێشتووە دۆست و خزم و قووتابی و نزیکەکانی خۆی پێی بزانن و بیانخاتە نارەحەتییەوە تەنانەت جگە لە حامیدی برام ماڵی باوکیشم دوای چەند ڕۆژێك پێیانزانی ئەویش بە سەردان هاتن بۆ ماڵمان ئەگەرنا نەیدەهێشت ئەوانیش بزانن.

دوای ئەوەی دادە باخان من و مامۆستای بە تەنیا جێهێشت، مامۆستا پرسی: شەهرام گیان لەگەڵ دێڕی ناو کتێبەکان بە کوێ گەیشتیت؟

_ بەچی بگەم، مامۆستا ئەم ماوەیە ئەوندە بە تامەزرۆییەوە

چاوم بڕییە ڕستەی ناو کتێبەکان تا گەیشتم بەو ڕستەیەی کە نووسرابوو "حەمە شەهرام واز لە کرێکاری بێنە".

+ بەڵێ ئەو شەوە غەزالی لێرە بوو باسی حاڵی تۆی بۆ کردم وە وتیشی "ئای مامۆستا ئەکرەم سەرت لە شەهرامە داماوەکەش تێکداو ئەویشت تووشی ئەم کاغەزە کرد کە پێی دەڵێن کتێب، چی دەبوو با شەهرامت تووشی کاغەزێك بکردایە کە پێی دەڵێن پارە".

_ بۆ مامۆستا مەگەر غەزالی خۆیشی خوێنەر نییە؟ لە ئەهلی کاغەزەکەی یەکەمیان نییە؟

+ با شەهرام گیان غەزالی نەك هەر خوێنەر ئێستە لە هەوڵی نووسینیشدایە، بەڵام مەگەر هێشتا غەزالیت نەناسیوە هەرجارەو بە ئاوازێك دەخوێنێت، ئەو هەر بۆ سوعبەت ئەو قسەیەی کرد ئەگەرنا غەزالی خۆی زوورزوو ئەم قسەیە بۆ من دەکات و دەڵێت مامۆستا ئەکرەم دەزانیت "خۆشحاڵترین مرۆڤ ئەو مرۆڤەیە کە لە کتێبەکانەوە دوورە، بەڵام ئەو خۆشحاڵیە هەرگیز شایەنی ئەوەی نییە خۆزگەی پێبخوازیت".

شەهرام گیان لەوانەیە ئەوە نەزانیت کە من لەبەر ناساغیەکەم بانگم نەکردوویت بۆ ئێرە، بەڵکو بەمەبەستی کارێکی تر بانگم کردویت.

_ چ کارێك مامۆستا گیان؟

+ باوکی باخانی خێزانم واتە باوکی غەزالیش دووکانی

جوملەفرۆشی "بسکیت و کێك و وشکەو ..."ئەو جۆرە شتانەی هەیە لە ناوبازاڕ، بەڵام لە نزیكماڵی خۆیان "کۆڵانی پشت ماڵی خۆیان" خانوویەکی بچووکی کردووە بە مەخزەن، ئەم مەخزەنە مامە حاجییەك کە ناوی "حاجی عەبدوڵا"یە، بەڵام هەر پێی دەڵێن کاك حاجی بە شەودا وەك پاسەوانێك تیایدا دەمێنێتەوە، جا ئێستە کاك حاجی بە باوکی غەزالی وتووە من ناتوانم هەموو شەوێك لە مەخزەنەکە بمێنمەوە چونکە جاروبار میوانێکە یاخود نەخۆشییەکە یان هەر شتێکی لەو بابەتە وا پێویست دەکات لە ماڵەوە بم، بۆیە ئێستە دەیەوێت لەبری کاك حاجی کەسێکی دیکە بۆ ماوەی دە شەو لە مانگێکدا پاسەوانی مەخزەنەکەی بۆ بکات، باوکی غەزالیش مەبەستیەتی کەسێکی باش بۆ ئەم کارە پەیدا بکات، منیش وتم لە ئێستادا ئەم کارە بۆ شەهرام زۆر باشە، بەڵام هەرچەندە من کارەکەم بەلاوە باش و گونجاوە دواجار بڕیاری ڕازیبوون یاخود ڕازینەبوون بە کردنی کارەکە لای خۆتە.

_ مامۆستا گیان من زۆر مەمنونی تۆو غەزالیشم بە ڕاستی هەرگیز ناتوانم پاداشتی چاکە و خەمخۆریتان بدەمەوە، من بۆ خۆم زۆر خۆشحاڵم بە کارەکە بە تایبەت لەم زروف و قۆناغەی منی تێکەوتووم، بەڵام ناتوانم بەبێ قسەکردن لەگەڵ باوك و دایکم وەڵامی کۆتایت بدەمەوە.

+ زۆر باشە لە زووترین کاتدا لەگەڵیان قسە بکە و وەڵامی من بدەرەوە، بەڵام ئەوەش بزانە خانووی مەخزەنەکە لەناو گەڕەکدایە

و لە چۆڵەوانیدا نییە وە لە حەوشەی خانووەکەشدا ژوورێکی بچووك دروستكراوە ئەوە ژووری تۆ و كاك حاجییە، هەڵبەتە ئەگەر ڕازیبوویت بە ئەنجامدانی كارەكە.

دوای كەمێكی تر دانیشتن لە تەنیشتی مامۆستاوە مامۆستا دەستێكی درێژ كرد بۆ لای كۆمەڵێك كتێب كە لەولایەوە دانرابوون وتی شەهرام گیان ئەو زەرفە كاغەزییە كە لای ئەو كتێبانە دانراوە بۆم بهێنە، بۆم هێنا و زەرفە كاغەزییەكەی كردەوە كۆمەڵێك كاغەز لە ناویدا بوو هەڵیڕژاندە سەر زەویەكە، وتی شەهرام گیان ئەم كاغەزانە هەمووی ئەو نامانەن كە وەختی خۆی مامۆستاكەم بۆی دەناردم منیش تا ئێستا هەڵمگرتوون و بەیناوبەینیش دەیانخوێنمەوە جا بەرلەوەی تۆ بێیت باخان گیان لەناو تاكی كتێبخانەكەدا بۆی دەرهێنام بەو نیازەی بیانخوێنمەوە، بەڵام ئەوەبوو تۆ هاتی و تەشریفی خێرت هێنا، ئەگەر پێتخۆشە پێكەوە چەند دانەیەكیان دەخوێنینەوە.

_ مامۆستا گیان من زۆر حەز دەكەم بە تایبەت كاتێك نووسینی ناو ئەم كاغەزە بۆرانە دەبینم ڕاستەوخۆ حەز دەكەم بیخوێنمەوە.

نامەی یەكەم:

"چیرۆكێك هەیە ئەوەندەی ئاوی حەوزی مزگەوتەكەی ئاوایی سازگارە، یەكێكی دیكە لە چیرۆكەكان بەقەدەر منداڵی پڕە لە پاكی و بەرائەت، چیرۆكەكەی دیكەش ئەوەندەی ئەو شاخ و

چیایانەی کە تائێستا قاچەکانی مرۆڤی پێ نەگەیشتووە سەختە،..... بەڵێ چیرۆکەکان زۆر زۆرن، بە هێندەی ژمارەی مرۆڤەکان چیرۆك هەیە، تەنانەت لەوەش زیاتر، دەتوانم بڵێم بە هێندەی ژمارەی مەخلوقات چیرۆك هەیە (چیرۆکی مرۆڤ، چیرۆکی ئاژەڵەکان، چیرۆکی ئاو، چیرۆکی بەرد، چیرۆکی شەیتان، چیرۆکی باران و چیرۆکی ئاگر و) تەنانەت چیرۆکی خوداش.

هەموو چیرۆکەکان لە ناو چیرۆکەکانی مرۆڤدا دەبینیتەوە، بەڵێ لە ناو چیرۆکی مرۆڤدا چیرۆکی ئاگر چیرۆکی باران چیرۆکی شەیتان، تەنانەت دەتوانیت چیرۆکی خوداش ببینیت.

تۆ چیرۆکنووس نیت تۆ خوێنەری چیرۆکەکانیت، خوێنەر ئازادترین بوونەوەرە، خوێنەر ئەوەندە ئازادە ئەگەر چیرۆکەکان باسی ناو بیر و ژێر زەوی بکەن ئەوا خوێنەر دەتوانێت بۆ خوێندنەوەیان بچێتە سەر لوتکەی چیایەك، ئەگەر چیرۆکەکان باسی خودا بکەن خوێنەر ئەوەندە ئازادە دەتوانێت شەیتان بێت.

هەوڵی نووسینی چیرۆکی چارەنووس وەکو هەوڵی مرۆڤی ناو دۆزەخ وایە کە بۆ چوونە ناو بەهەشت دەیدات. هەوڵی گۆڕینی چیرۆکی چارەنووس وەکو هەوڵی دروستکردنی خودایەکی دیکە وایە. هەوڵی ئەوە مەدە چیرۆکی چارەنووسی خۆت وەك چیرۆکی چارەنووسی من بخوێنیتەوە، تەنها لەو شوێن و کاتەدا چیرۆکی چارەنووسی من و تۆ هاوشێوەی یەکن کە چیرۆکنووسەکە من یاخود تۆی لەبیر چووە".

نامەی دووەم:

"لەو ساتەوەی ئاگری عیشق بەردەبێتە ڕۆحی تۆ، لەو ساتەوەی ئاگری عیشق لە دڵ و گیانی تۆدا هەڵدەگیرسێت ئیدی دەبێت بۆ یەك ساتیش لەو ئاگرە غافڵ نەبیت، دەبێت بەردەوام باوەشێنی بکەیت، ئەگەرنا ئەو ئاگرە خامۆش دەبێت.

تۆ دەزانیت تا ئاسۆیی بیر بکەیتەوە زیاتر و زیاتر لە ئارامیماڵئاوایی دەکەیت... لە هەموو شوێنێك مرۆڤ نیازی بە پیرێك هەیە چونکە بۆ هەمیشە مرۆڤەکان نیازیان بە سەرهەڵبڕین هەیە. مرۆڤ بۆئەوەی سەرهەڵبڕێت هیچ پێویستی بەوە نییە قاچی لە زەوی دابڕێت، ئەسڵەن مرۆڤ کە بەرز بوویەوە ئیدی دەبێت سەیری خوارەوە بکات تا بزانێت لەسەر چی ڕاوەستاوە. بەڵێ ئەوە بزانە ئەو پلیکانەیەی تۆ دروستی دەکەیت بۆ ئەوە نییە بتگەیەنێتە سەربان! ئاخر ئەگەر مەقسەدی تۆ تەنها ئەوەیە کە بگەیتە سەربان ئەوا هەر سەربانێك لە چەند لاوە دیواری لە ژێردایە و تۆش بە یەکێك لەو دیوارانەدا سەرکەوەرە سەربان، ئیدی پلیکانە بۆچی؟!

لەم مەسەلەیەدا سەربانیش شتێکی زیاتر لە پلێکی پلیکانەکە نییە.

لاف لێدان بە گەیشتنە سەربان شیرکە نەك عیشق.

هەوڵدان بۆ گەیشتنە سەربان لە ئاسمانپەرستی بەولاوە شتێکی تر نییە".

نامەی سێیەم:

"مرۆڤە مەزنەکان ئەوانە نین هێزیان زۆرە. ئەوانەش مەزن نین شوێنکەوتەیان زۆرە. ناتوانم باوەڕ بە گەورەیی زاناکان بکەم. لای من شۆڕشگێڕەکانیش مەزن نین. تا ئەم ساتە نووسەرێکم بە مرۆڤێکی مەزن وەسف نەکردووە. هەر نووسەر نا، بەڵکو بیریار و فەیلەسوف و فەقیە و عارف و شاعیرەکانش ناتوانم بە مەزنیان لە قەڵەم بدەم.

بڕیار نییە مرۆڤ مەزن بێت لەبەرئەوەی شتێك دەزانێت یاخود شتێك دەنووسێت یان شتێك دەڵێت، ئەم شتانە زۆرجار مرۆڤ تووشی کیبر دەکەن نەك مەزنی. کیبر ئەگەرچی مانای گەورەیی هەیە، بەڵام لە گەورەیی مرۆڤ کەم دەکاتەوە.

مرۆڤ بۆ ئەوەی مەزن بێت ڕێکخستنی پێویستە. بەڵێ تۆ لە هەر جێیەك و هەر سەردەمێکدایت بۆ مەزن بوونت ئەوەندە بەسە گوفتار و ڕەفتارت دوو شتی جیاواز نەبن! شاعیر چۆن مەزن دەبێت ئەگەر ناسك نەبێت... عارفی بێ صەبر هەرگیز بوونی نییە... لە هەرجێیەك دەرفەتی تێڕامان نەبوو چاوەڕێ مەبە بیریارێك هەڵبکەوێت.

ئەسڵەن گەورەیی تەعبیرە نەك حەقیقەت".

نامەی چوارەم:

" نەکەیت هەروا بە سادەیی دۆستایەتی دروست بکەیت، ئەگەر قەرار بێت دۆستەکان ببنە دۆستی ژیانی تۆ ئەوا دەبێت هەڵیانبژێریت نەك تووشیان بیت، بۆ هەڵبژاردنی دۆستەکانت مەڕوانە بۆ چاوی، نا هەرگیز بۆ چاوی مەڕوانە. بەڵکو بۆ ڕۆحی بڕوانە. سەیری ئیمانی مەکە، سەیری ڕۆحی بکە. ئەوەی بۆ نێوانی تۆ و ئەو پێویستە ڕۆحە نەك شتی دی.

کوا شەو چاوی هەیە، کوا شەو ڕوخساری هەیە، ئادەی ئیمانی شەوم پێ نیشان بدە. نا دەست هەڵگرەو خۆت ماندوو مەکە چونکە کاری وا ناتوانیت، شەو ئەم شتانەی نییە. شەو تەنها ڕۆحی هەیە. بۆیە ڕاست ناکەن کە دەڵێن شەو تاریکییە، نەخێر شەو تاریکی نییە، بەڵکو شەو نوورە، بەڵام ڕۆحی دەوێت نەك چاو، چاو هەرچەندێك بینا بێت هێشتا سنووردارە، ئەگەر ڕاستدەکەیت بڕۆ بەر بە نوور بگرە! بۆیە ئەو کەسە بکەرە دۆست کە ڕۆحی مەزنە، ئەگەر هیچیش نەزانێت، بۆ ژیان ئەوەندە بەسە کە ئەهلی عیشق و مەعنەویەتە، ئەم ئەهلە پێویست ناکات هیچ بزانن، باوەڕیان بە زانین نییە، عەمەل ڕۆحی داگیر کردوون. .

گوڵێك شایەنی تۆی نییە نەکەیت بیدەیت لە یەخەت، تەنانەت بۆنیشی مەکە، بەڵێ قبوڵی بکە بە دۆست ئەگەر هیچی نەبوو تەنها ڕۆح نەبێت، بۆ دۆستایەتی ڕۆح بەسە".

نامەی پێنجەم، کۆتا نامە کە من خوێندمەوە:

"بەرلەوەی هەنگاو هەڵبگریت سەیرێکی پێشەوە بکە، بڕیار نییە ڕێگەکە هەمووی تەخت بێت، خۆ ئەگەر چوویت و هەر لە دوورەوە بینیت ڕێگەکە تا ئەوسەری تەختە و بێ هەوراز و نشێوە ئەوا زوو لێی لادە، ئەو جۆرە ڕێگایە هی تۆ نییە، چونکە تۆ ئەهلی چێژو لەززەتی، کوا تەختاییەکان چێژ بە مرۆڤ دەبەخشن؟ ئەوە چاڵەکانن پڕن لە ئاوی حەیات. تامی ژیان ئەوەتا لەسەر لوتکەی شاخەکان، تەنها ئەو تەیرانە لە ژیان بێزارن کە ناجوڵێن (ئەو تەیرانەی لە قەفەسدان) قەفەس زیندانە.

پرسیاری تامی ژیان لە کەس مەکە، بڕۆ بیچەژە. ژیان وێنەیەکی فۆتۆگرافی نییە بۆ ئەوە گیرابێت سەیری بکەیت، ژیان دەبێت وێنەی تێدا بگیرێت. لە هەرجێیەك تینوێتیت شکا ئەوە ژیان نییە، ئەوە فێڵی ژیانە، لە ئەسڵدا ئەوە ژیانە کە تینووت دەکات، بۆیە چێژیش هەر لە تینووبووندایە، تەنانەت مرۆڤەکان لەو شوێنەی ژیاندا ئومێدیان هەیە کە تینوون، بەڵێ ئومێد و هیوا ئاوی ژیانە، بۆیە ژیان لەو شوێنە تەڕە کە ئومێد بوونی هەیە، ژیانیش دەبێت تەڕ بێت ئەگەرنا هیچی لێ ناچۆڕێت.

ڕاکە بە دوای ژیاندا... بەڵێ بە دوای ژیاندا ڕاکە، بەڵام بۆ ئەوە نا کلاوێك بۆ سەری خۆت پەیدا بکەیت، نا هەتا دەتوانیت بە دوایدا ڕاکە بەڵکو کلاوەکەت با بیبات، تا شتێك زیاترت پێوە بێت

قورستری، ئاگاداربە مرۆڤی قورس ژیان قورس دەکات".

_ مامۆستا زۆر سوپاس بۆئەوەی ئیزنت بە من دا ئەم نامانە بخوێنمەوە، وا کاتم درەنگ کردو حەزیش ناکەم بەم حاڵەوە لەوە زیاتر تۆ بێتاقەت بکەم بۆیە ئەگەر ئیزن بدەیت من دەمەوێت بڕۆم.

+ شەهرام گیان بێتاقەتی چی خۆشترین کاتەکانم ئەو کاتانەیە کە تۆ و غەزالی هاودەمیم دەکەن، بەڵام ئەگەر دەڕۆیت ئەوا هەوڵبدە زوو وەڵامی مەسەلەی پاسەوانییەکەی مەخزەنەکەم بدەیتەوە.

_ بەسەرچاو مامۆستا گیان.

ئیدی دوای خوداحافیزی لە مامۆستا و دادە باخان لە ماڵیان هاتمە دەرەوەو بەدەم ڕێگابڕینەوە لە قوڵایی دڵ و گیانمەوە زوبانی شوکر و حەمد و سەنام کەوتە جوڵەو زۆر سوپاسی خودام کرد بۆ ئەو کارەی کە بە ویستی خودا بڕیارە ببێت بە نسیبم، تەواو خۆشحاڵ بووم بەو کارە چونکە هەم شوێنەکەو هەم کاتەکەیشی زۆر گونجاوە لەگەڵ هەلومەرجی گشتی من، بە تایبەت زۆر گونجاوە بۆ خەریکبوون بە خوێندنەوەوە کە ئەمەیان ئەوپەڕی مەبەستی من بوو.

بۆ شەوەکەی دوای خواردنی نانی ئێوارە لەگەڵ باوکم و دایکم بابەتەکەم باسکرد، باوکم وتی کوڕم کارەکە خراپ نییە ئەگەر خۆت حەزت لێی بێت و لەگەڵی کێشەت نەبێ من لاریم لێی نییە و بیکەیت باشە، بەڵام دایکم بە تەواوی ڕەزامەند نەبوو لەسەر کردنی ئیشەکە ئەویش لەبەرئەوەی کاتی ئیشەکە شەوان بوو وە منیش لەو مەخزەنە بە تەنهام، بەڵام هەرچۆنێك بێت لەگەڵ باوکم

دایکیشمان ڕازیکرد، بۆیە ڕۆژی دواتر وەڵامی ڕازیبوونم بە کارەکە لە مامۆستا گەڕاندەوە، مامۆستاش وتی شەهرام گیان سبەی نا دوو سبەی ئەگەر خۆم حاڵم باشتر بوو ئەوە پێکەوە دەچین بۆ لای باوکی غەزالی، خۆ ئەگەر منیش نەمتوانی ئەوا بە غەزالی دەڵێم بتبا بۆ لای باوکی و ئەوەی کە پێویستە پێکەوە قسەی لێوە بکەن.

سوپاس بۆ خودا پاش دوو ڕۆژەکە حاڵی مامۆستا تەواو باش بووبوو بۆیە دەمەو ئێوارە بوو لەگەڵ مامۆستا چووین بۆ لای باوکی غەزالی کە ئەو کاتە ئەو لە دووکان بوو، کە گەیشتینە بەردەم دووکانەکە مامۆستا وتی کاتێکی باش هاتین چونکە کاك حاجی پاسەوانیشی لێیە، چووینە ژوورەوە و لە پاش سەلامکردن و مەرحەبایکردن مامۆستا من و کاك محمدی باوکی غەزالی و کاك حاجی پاسەوانی بەیەکتر ناساند، کاك محمد وتی کاك شەهرام باخان و مامۆستا ئەکرەم تا ئێستا یەك دوو جار لە ماڵ ئێمە باسی تۆیان کردووە بەڕاستی قسەکانی ئەوان تەواو ڕاست بوو کوڕێکی لەبەردڵان و لەدڵا شیرینی، ئیتر لە قسەکانی باوکی دادە باخانەوە بۆم دەرکەوت تەنها دادە باخان نییە وا میوانی ماڵی خۆی خەجاڵەت دەکات، بەڵکو ئەم ئەخلاقەی دادە باخان لە باوکییەوە بۆی ماوەتەوە، لەم کاتەدا مامۆستا پرسی لە کاك محمد ئەی توخودا دایکی باخان چۆنە؟ باشتر نەبوو؟ کاك محمد وتی وەڵا هەروەکو خۆیەتی و جارجارەش زیاتر لێی سەخت دەکات، بەڵام ئەمڕۆ برادەرێکم هاتە لام و وتی باشترین ڕێگەچارە ئەوەیە بیبەیتە لای دکتۆری دەرەوە بە تایبەت بۆ وڵاتی ئێران.

یەکسەر پاسەوانەکە "کاك حاجی" وتی خوای گەورە شفای بۆ بنێرێت و ڕەحمی پێبکات، بەخودا کاك محمد گیان ڕاستە لە نەخۆشخانەکانی ولاتانی دەرەوە پزیشك و دەرمانی باشتری لێیە، بەلام هەر ئەو خوایەی لێیە کە لێرەش هەیە بۆیە من تەنها باوەڕم بە دوعا ماوە.

لەگەلّ کردنی ئەم قسەیەی کاك حاجی مامۆستا ئەکرەم بە جۆرێك تەماشایەکی منی کردو بزەیەك و چاوداخستنێکی کرد، ئیتر پاش ئەوەی قسە و باسمان کرد دەربارەی ئیشەکە و دیاریکردنی بەرواری دەستپێکردنی من بە ئیشەکە، من و مامۆستا هەستاین و ئەوێمان جێهێشت تا ئەو جێیەی ڕێمان یەك بوو لەگەلّ مامۆستا بەدەم بڕینی ڕێگاوە بەمجۆرە قسەمان دەکرد:

+ شەهرام گیان ئەوەش ئیشێکی خۆش و باش ئیتر هەر بۆ خۆت بخوێنەرەوە.

_ سوپاس بۆ خودا... بە ڕاست مامۆستا کەی مەجالت دەبێت خۆم و دەفتەری پرسیارەکانم بێنی بۆ لات و گویّ لە وەلامەکانت بگرین؟

+ مەبەستت ئەو دەفتەرەیە کە تایبەتت کردبوو بە خوێندنەوەی ئەو کتێبەی ئەو جارە کڕیبووت؟

_ بەلّیّ ئەوەم مەبەستە، بەلام بەخودا دوای ئەوەی شەوەکە لە مالّ خۆتان باسی کتێب و خوێندنەوە و خوێنەر و نووسەرت بۆ کردم جارێکی تر سەرلەنویّ کتێبەکەم خوێندەوە، بەلام ئەمجارەیان لە خوێندنەوەیدا گەیشتم بە وەلامی هەندێك لەو

پرسیارانەی کە لە خوێندنەوەی جاری یەکەمەوە بۆم دروست بووبوون کەچی لەمجاری دووەمەدا هەندێك پرسیاری دیکە سەنگەریان لە عەقڵم گرتووە و بە گومان تەنگیان بە ئیمانم هەڵچنیوە.

+ من لە خزمەتتدام شەهرام گیان، لەبەرئەوەی دایکی باخان بەو حاڵی نەخۆشیەوە دەتلێتەوە لە ئێستادا بۆ یارمەتییان باخان زوورزوو دەچێتە لایان بۆیە بڕیارە سبەی شەو هەر خۆم لەماڵەوە بم، ئەگەر تۆ بۆت دەگونجێت وەرە بۆ ماڵ ئێمە.

_ زۆر باشە، بەڵام باوەڕ ناکەم بە شەوێك و دووان وازت لێ بێنم.

+ ئەو کاتە تازە باخانم گواستبوویەوە پاش ماوەیەك بە تەواوی لەگەڵ غەزالی تێکەڵ بووین و لە یەك تێگەیشتین، ئەویش وەك تۆ وا بوو، بەڵام غەزالی داوایکرد لە هەفتەیەکدا یەك شەوی تایبەتمان هەبێت بۆ دانیشتن و قسە و باسی مەعریفی دەربارەی چەند بابەتێك کە لای ئەو زۆر زۆر ئاڵۆز بوون، بۆیە ئیتر زۆربەی جارو بە پێی مەجال لە هەفتەیەکدا شەوێك دەهات بۆ لامان بۆ لادێ وە ئەو شەوانە باخانیش لەگەڵمان دادەنیشت و زۆر بەشداری جددیشی دەکرد لە قسەکانماندا.

+ دەی مامۆستاکەم لێرەدا ڕێگەی قاچەکانی من و تۆ لەیەك جودا دەبنەوە، بۆیە دەبێت لێرەوە خوداحافیزیت لێ بکەم، لەسەر ئیزنی خودا سبەی شەو یەکتر دەبینینەوە.

+ باشە شەهرام گیان لێرەدا لەیەك جودا دەبینەوە، بەڵام ئاڕاستەی ڕۆحمان پێچەوانەی قاچەکانمانە چونکە ئەوەتا قاچی

تۆ بەرەو لای سەرەوەی ڕێگاکە دەڕوات، بەڵام ڕۆحت بەرەو خوارەوە بۆ لای من دێت هەروەك چۆن قاچەکانی من بەرەو خوارەوەی ڕێگاکە دەچن، بەڵام ڕۆحم بەرەو سەرەوە بۆ هاودەمی تۆ دێت، بە خودات دەسپێرم ئازیزەکەم، ئاگاداری خۆتبە.

ملی ڕێگەم گرت، بەڵام هەروەکو مامۆستا ئەکرەم وتی بە هاودەمی لەگەڵ ڕۆحی ئەودا، تا ماڵەوە چەند جارێك وێنەیەك تەواوی خەیاڵمی داگیر دەکرد ئەویش وێنەی پێکەوە دانیشتنی مامۆستا ئەکرەم و مامۆستاکەی بوو، بە خۆمم دەوت دەبێت ئەو مامۆستایەی مامۆستا ئەکرەم چۆن پیاوێك بووبێت وا مامۆستا ئەکرەم ئەوەندە خۆی بە شاگردو قووتابی ئەو دەزانێت، هەرچۆنێك بێت گەیشتمەوە ماڵەوە، بەڵام کات لایدابوو لە بانگی ئێوارە بۆیە کاتێك چوومە ماڵەوە نوێژم خوێندو چووم بەرەو سفرەکە، بەڵام دایکم سفرەی هەڵگرتبوو تەنها لە ناو قاپێکدا بڕێك خواردنی بۆ دانابووم، منیش دەستمکرد بە خواردنی و تا تەواوم نەکرد دەستم لێ هەڵنەگرت.

ئیدی پاش نزیکەی کاتژمێرێك دانیشتن لای باوکم و دایکم، چوومەوە بۆ لای کتێبەکان و دەستمکرد بە تەماشاکردن و خوێندنەوەی بەشێك لە سەردێڕ و بابەتەکانی ناو ئەو دوو ڕۆژنامەیەی دوای جیابوونەوەم لە مامۆستا ئەکرەم لە بازاڕ کڕیم، دواتر دەستمکرد بە خوێندنەوەی کتێبێکی تازە، باسی لە مەرگ دەکرد دوای خوێندنەوەی بەشێك لەو کتێبە بە خۆزگەی گەیشتن بە دانیشتنەکەی سبەی شەو چاوەکانم لێکناو نووستم.

شەوی دواتر کاتێك گەیشمە نزیك کۆڵانەکەی ماڵ ماموستا ئەکرەم دەنگی بانگبێژێك کە موسڵمانانی بۆ خوێندنی نوێژ ئاگادار دەکردەوە لە منارەی مزگەوتەکەوە هات، بۆیە چوومە مزگەوت نوێژەکەم خوێند پاشان چووم بۆ ماڵ ماموستا هەرچەندە لە مزگەوت چاوم بۆ گێڕا بەڵام ماموستام نەدی، گەیشتمە ماڵ ماموستا بینیم ماموستا گوێی هەڵخستووە بۆ ئەو دەنگەی لە تەجیلەکەی تەنیشتییەوە دەردەچوو کە بریتی بوو لە قسەکردنی پیاوێك هەرچەندە ئەم پیاوە لە قسەکانیدا چەند وشەیەکی دەوت من نەمبیستبوون، بەڵام حاڵیبووم کە باسی "پەروەردەی منداڵی دەکرد لە لایەن دایك و باوکەوە"، کاتێك ئەو پیاوە لە قسەکانی تەواو بوو ماموستا تەجیلەکەی کوژاندەوە و کاسێتەکەی دەرکرد، جا کە ماموستا وتی ئەمجارەش بەخێربێیت کاکە شەهرام یەکسەر سەیرێکی دەستەکانی خۆمم کرد بینیم دەستم بەتاڵە بۆیە کەوتەوە بیرم ئەو زەرفەی دەفتەر و کتێبەکەمی تیا بوو لە مزگەوت لە تەنیشت پایەکە جێمهێشتووە، بەپەلە گەڕامەوە بۆ مزگەوت "تا

ئەو سەردەمە بەشەوانیش دەرگای مزگەوت دانەدەخرا" چوومە ژوورەوە زەرفەکە لە جێی خۆی نەمابوو چوومە حەوشەی مزگەوتەکە مام حاجییەك خەریکی ئاودانی ئەو چەند درەختەی ناو حەوشەکە بوو لێم پرسی مامە حاجی لە تەنیشت پایەکەی ژوورەوە زەرفێکی لێبوو نەتبینیوە؟ وتی با باوانەکەم ئەوە من لامبرد خستمە ناو تاقی دیوارەکەی ژوورەوە، منیش سوپاسمکرد پاشان چووم هەڵمگرت و گەڕامەوە بۆ ماڵ ماموستا ئەکرەم.

+ چی بوو؟ وابزانم کە جاری یەکەم هاتیتە ژوورەوە ئەو زەرفەت پێ نەبوو.

_ ڕاست دەکەیت ماموستا گیان ئەم زەرفەم لە مزگەوتەکە جێمهێشتبوو چووم هێنامەوە.

+ شەهرام گیان ئەی دەنگوباسی ماڵەوە دایەو باوە چۆنن؟ خۆت چۆنیت لەگەڵیان، خۆ گلەییان لێت نییە؟

_ سوپاس بۆ خودا زۆر باش و سەلامەتن، منیش خراپ نیم لەگەڵیان، هەرچەندە "دایك و باوکم فێریان نەکردم لەگەڵ کتێب چۆن مامەڵە بکەم، بەڵام کتێب فێری کردم چۆن لەگەڵ ئەوان مامەڵە بکەم".

دواتر بە خۆم و زەرفەکەوە چوومە تەنیشتی ماموستاو لای چەپیەوە دانیشتم دەفتەر و کتێبەکەم لە زەرفەکەدا دەرهێناو دەفتەرەکەم دایە دەست ماموستا ئەکرەم ئەویش کردییەوەو دەستیکرد بە خوێندنەوەی پرسیارەکان، بەڵام بە دەنگێکی نزم،

منیش کتێبەکە "کتێبە بەرگ ڕەشەکە"م بەدەستەوە بوو لاپەڕەکانیم هەڵدەدایەوە و دەگەڕام بەدوای ئەو دەقانەدا کە لە کاتی خوێندنەوەدا بە قەڵەم لەناو دوو نیوە کەوانەدا دیاریم کردبوون.

لە ناکاو مامۆستا ئەکرەم دەنگی بەرز کردەوەو وتی:

ئای لەم پرسیارە چەندە مەزنە "ئیمان گەورەترە یان مەعریفە؟" منیش بە بزەیەکەوە وتم بۆچی مامۆستا پرسیارەکانی ترم بچووکن، مامۆستاش بەدەم بزەکردنێکەوە سەری داخستەوە و دەستیکردەوە بە خوێندنەوەی پرسیارەکان، پاش ئەوەی لە خوێندنەوەی پرسیارەکان تەواو بوو وتی:

+ شەهرام گیان من ترسێکم هەیە، بەڵام خودا یار بێت ئەو ترسەیش ناهێڵین.

_ مامۆستا چ ترسێك؟

+ لەبەر گەورەیی پرسیارەکانت ترسی ئەوەم هەیە توانای تێگەیشتن لە وەڵامەکانیت نەبێت، بەڵام بۆئەوەی وەڵامەکان بە ڕوونی بگات بە تۆ وە باش لێیان حاڵی ببیت، بەوجۆرە ناکەین کە دانە بە دانەی پرسیارەکان بەدوای یەکدا وەڵام بدەینەوە، لەبەرئەوەی پرسیارەکان لە چەند ڕوویەکەوە پرسیارکردنن لە ئیمان دەبێت وەڵامەکانیش بە شێوەیەکی گشتی لەو چەند ڕووەوە بێت.

شەهرام گیان ئەمشەو چەندێك توانا و کەڵکمان بوو هەڵبەتە

بە سوود وەرگرتن لە نووسین و ئەزمونی ئەو ژیرە پیاوانەی دەربارەی ئیمان نووسیویانە و وتویانە بۆ شەنوکەوکردنی بابەتێکی وەکو ئیمان من و تۆش پێکەوە قسە و باسی خۆمانی لێوە دەکەین.

_ بەڵام مامۆستا نازانم بۆچی تا ئێستا هەر نووسینێکم دەربارەی بابەتی ئیمان خوێندبێتەوە یان هەرکەسێك دەربارەی ئیمان قسەی بۆ کردبێتم یەکسەر لە ناو خۆمدا هەستم بە شپرزەیی و ئاڵۆزی کردووە و هەستەکانم پەرش و بڵاو بوون تا دەرئەنجام ئەم ئاڵۆزی و شپرزەبوونە ناوەکیە و پەرشبوونی هەستەکان بوونەتە دیوار و ڕێگر لەبەردەم تێگەیشتنم لە بابەتی ئیمان؟

+ شەهرام گیان شتێك دەتوانیت لێی تێبگەیت کە بتوانرێت ئەو شتە پێناسە بکرێت واتە مرۆڤەکان لەو شتە تێدەگەن کە مرۆڤەکان خۆیان توانای پێناسەکردنی ئەو شتەیان هەبێت، بەڵام غەزالی گوتەنی "بەهەڵە لێم تێنەگەیت مەبەستم غەزالی برای باخانی خێزانم نییە" بەڵکو مەبەستم لە ئیمامی غەزالییە ئەو ئیمامی غەزالییەی وەستا دارتاشەکە زۆر خاتری ئەوی لەلا بوو، ئەو ئیمامە دەڵێت (ئیمان پێناسە ناکرێت، بەڵکو ئیمان شتێکە دەبێت بیچەژی) بەو ئومێدەی ئەم قسە و باسەی خۆمان کە دەربارەی ئیمان دەیکەین تۆ بە پێناسەی ئیمان لێکی نەدەیتەوە، چونکە ئیمان پێناسەی نییە، تەنانەت خودا لە قورئاندا بە ڕەهایی

پێناسەی ئیمانی نەکردووە بەڵکو خودا لە ناو ئایەتەکانی قورئاندا دەیەوێت بەهۆی کێشانی وێنەی ئیمانداروە ئێمە چێژی ئیمان بکەین بۆیە هەتا ئەو وەختەی تۆ بە نیازی دەستکەوتنی پێناسەی ئیمان بیت ئەوا بەو جۆرەی خۆت وتت شپرزو ئاڵۆز ئەبیت وە لەگەڵ چەشتنی چێژی ئیماندا ڕووبەڕووی گرفت دەبیتەوە.

کاکە شەهرام لە ناو ئەو پرسیارانەدا کە لە تیانووسەکەی خۆتدا نووسیبووت پرسیارێکی تیابوو، ئەگەر بە وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە دەستپێبکەین لەوانەیە دەستپێکێکی زۆر باش بێت بۆ ئەم بابەتە.

_ مامۆستا کام پرسیارەیان؟

+ کاکە شەهرام ئەو پرسیارەی تیایدا داوای وێنەی ئیمانت کردووە و دەتەوێ وێنەی ئیمان ببینیت.

_ بەڵێ ... بەڵێ ... دەزانم کام پرسیارە دەڵێیت.

+ شەهرام گیان یەکێك لە ئەدیب و گەورە عارف و شاعیرەکانی میللەتی کوردی خۆمان لە ڕێی نووسینی جۆرێك لە شیعرەوە ئەو پرسیارەی تۆی وروژاندووە دواتر هەر بەو شیعرە زۆر بە زوویی و بە ڕوونی وەڵامی داوەتەوە.

_ بمبورە... بەڵام مامۆستا ئەوەمان لە یاد نەچێت کە ئێمە ڕێك کەوتین لەسەرئەوەی سەرەتا لە ڕووگەی دەقە دینییەکانەوە باس لەم بابەتە بکەین نەك لە زمانی ئەدەب و شیعرەوە.

+ شەهرام گیان منت تەواو خۆشحاڵ کرد کاتێك دەبینم بەو

ڕادەیە ورد لەگەڵ بابەتەکەدا دەڕۆیت، بەڵام من وتم شیعرەکەی ئەم شاعیرە جۆرێکی تایبەت و سەرسوڕهێنەرە لە شیعر کە دەتوانم بڵێم جارێکی تر نووسینەوەی دەقە قورئانییەکانە لەناو شیعردا، بەدەر لەوەش لە باسێکی وەکو ئیماندا یان ڕاستتر بڵێم لە کێشانی وێنەی ئیماندا زۆرینەی جار شاعیرەکان وێنەکێشێکی سەرکەوتوون و وێنەی شاعیرەکان جوانتر و بەچێژترە، ئەم شاعیرە لەم کتێبەیدا کە دەڵێن لە یەکێك لە زانکۆ ئیسلامییە جیهانییەکانیش دەخوێندرێت لە بابی ئیماندا ئەم شیعرە دەڵێت:

تەعریفی ئیمان، شەرعەن تاڵبی

تەصدیقە و ئیزعان، قوبووڵی قەلبی

واتە ئەگەر بەدوای ئەوەوەی یان تاڵبی ئەوەی کە واتاو مانای ئیمان تێبگەیت یان عەوداڵی وێنەی ئیمانیت (شەرعەن تاڵبی) دەی ئەوە بزانە کە ئیمان (باوەڕو وەرگرتنی دڵە).

واتە ئەم ئیمانە کە بە تەصدیق و باوەڕ تەفسیرمان کردووە ناکرێت حسابی بکەین بە مەعریفە یان بە مەعریفە لە قەڵەمی بدەین یان ئەگەر ڕونتر بڵێم بەدەستهێنانی مەعریفە ناکاتە بەدەستهێنانی ئیمان چونکە مەعریفە خۆی بەتەنیا بابەتێکی جیاوازە و مەسەلەیەکی ترە، هەر ئەم قسەیە "مەعریفە شتێکی دیکەیەو ئیمان نییە" شاعیر بەم چەند دێڕە پێمانی دەڵێت:

لە بابی علووم مەعاریف حیساب

نییە، بۆچ؟ کەثیر لە ئەهلی کیتاب

(عرفوا أن خير المنذرين
رسول، وقد كانوا كافرين)

چونكە كۆمەڵێكمان هەبووە لە ئەهلی كیتاب كە زانیویانە (مەعریفەیان) بەوە هەبووە موحەمەد ڕەسوڵی خودایە و ئەو زاتەیە كە پێغەمبەرانی پێشوو مژدەیان داوە بە ڕەوانەكردنی، وەڵێ لای خودا بە كافریش واتە بێباوەڕ حسابكراون. جا ئەگەر ئیمان تەنها بریتی بوایە لە مەعریفە و زانین ئیدی دەبوایە ئەوانە بە موسڵمان حساب بكرانایە، كەچی خودا بە كافر و بێباوەڕ ناوی بردوون.

بۆیە كە دەڵێین ئیمان یەعنی (تەصدیق و ئیزعانی قەلبی)، ئەوا لێرەوەیە كە ئیتر مەعریفە شتێكی ترە، بابەتێكی تری جیاواز لە بابەتی ئیمانە یان ئەگەر مەعریفە زانین و ناسین بێت ئەوا ئیمان شتێكی دیكەیەو كاری دڵە.

ئیمان ئەو تەسلیمبوونە قەلبییەیە كە وتمان نەك ئەوەی ئیمان بریتی بێت لە مەعریفە و زانین، چونكە ئەگەر بڕیار بێت ئیمان مەعریفە و زانین بێت، كەواتە دەبێت هەر تاكێكی خاوەن ئیمان خاوەنی مەعریفەش بێت خاوەنی زانین بێت "شتگەلێكی زۆر بزانێت" شەهرام گیان ئەگەر ئێمە وا لە ئیمان تێبگەین كە هەركەسێك مەعریفەی زیاتربوو ئەوا ئیمانیشی زیاترە یان هەركەسێك كتێبی زیاتر خوێندەوە ئیدی ئیمانیشی لەوانی دی زیاترە ئەمە تێگەیشتنێكی دروست نییە چونكە ئەگەر بەم تێگەیشتنە بێت من ئیمانم لە دایكم زیاترە! كە من هەرگیز ناتوانم

باوەڕ بەمە بکەم، وە لە واقیع و مێژووی موسوڵمانانیشدا بە سەردەمی پێغەمبەریشەوە وەها شتێك بوونی نییە، شتێك کە دەبێت تاك بە تاکی ئیمانداران خاوەنی مەعریفە بن.

بۆیە ئەگەر ئیمانداربوون یەعنی ئەوەی بوون بە خاوەنی مەعریفە دەی کەواتە ئەو دابەشکارییە چییە بۆ ئیماندار کراوە لای بیریاران و ڕۆشنفکرانی ئایینی، ئەگەر ئێمە ئەوەمان قبوڵ بێت کە بوون بە خاوەنی مەعریفە و مەعریفەخوازبوون دەکاتە ئیمانداربوون وە ئەمەش بە ڕاستترین پێناسەی ئیمان لە قەڵەم بدەین ئەو وەختە هەر ئینسانێك خاوەنی مەعریفە نییە دەبێت بە بێباوەڕی لە قەڵەم بدەین کە ڕاستی ئەم مەسەلە هەرگیز بەمجۆرە نییە چونکە نەبوونی مەعریفە لای ئینسانێك نەك هەر نیشانەی بێ ئیمانی ئەو ئینسانە نییە، بەڵکو ئەمە جۆرێکە لە جۆرەکانی ئیمانداری.

بۆیە ئەو دابەشکاریەی بۆ ئیمانداری کراوە یان ئیمانداری دابەشکراوە بۆ چەند جۆرێك یان چەند پلەیەك ئێمە ناتوانین ڕەددی بکەینەوەو قبوڵمان نەبێت، چونکە بە تێڕامان و تێگەیشتنمان لەو ئایەتانەش کە باسی بەهەشتمان بۆ دەکەن دەگەینە ئەو ڕاستیەی کە تەنانەت لەوێش لە (بەهەشت) حسابی جیاواز کراوە بۆ ئیمانداران، بۆیە ئەسڵەن ئەوە خوای گەورە خۆیەتی ئەوە قورئان و ئایەتەکانی ناویەتی ئاگادارمان دەکاتەوە لەم جۆراوجۆریەی ئیمانداری.

جا چەندین ئایەت لەو ئایەتانەی قورئان کە باس لە ئیمان دەکەن جارێکی تر ئەوەمان پێدەڵێن کە ئیمان تەصدیق و باوەڕی قەلبییە، نەك ئەوەی ئیمان بریتی بێت لە مەعریفە و زانین، بەڵکو ئەوە عەقیدەیە بریتیە لە مەعریفە و زانین ئەوە عەقیدەیە بریتیە لە تێگەیشتن و حاڵیبوون تەنانەت زۆرجار ئەم حاڵیبوونەش تەنها حاڵیبوونێك و تێگەیشتنێکی عەقڵییەو بەس تەنها زانینێکی ساردوسڕەو تەواو زانینێکە کاریگەری ئیجابی لەسەر ئەخلاق و دڵ و دەروون دروست ناکات، زانینێکە مرۆڤ گەرم ناکاتەوە بۆنمونە هەندێکجار عەقیدە فەلسەفیەکان لەم جۆرەن بۆیە مرۆڤ خاو دەکەنەوە، ئەمە لە کاتێکدا ئەوەی قورئان باسی دەکات ئیمانە نەك عەقیدە.

دەکرێت بە ئیماندار حساب نەکردنی ئەو ئەهلی کیتابانە لەلایەن خوداوە لەو ڕوانگەیەوە بووبێت کە لە ناخی دڵیانەوە ڕقیان لە موحەمەد بووە ڕقیان لە ڕێساکانی ئایینی ئیسلام بووە واتە عیلم و مەعریفە و تەصدیقیشیان بە موحەمەد هەبووە، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ڕقیشیان لێبووە و بەربەرەکانێیان کردووە بۆیە لەلایەن خوداوە بە خاوەن ئیمان حیساب نەکراون، جا شەهرام گیان ئەمە بە تەنیا خەبەرێك نییەو بەس، بەڵکو ئەمە ئەو خەبەرەیە کە ڕاچڵەکانێك بە ئیمانداران دەکات و پێیان دەڵێت ئیمانداربوون تەسلیمبوونی دڵ و هەروەها موحیببەتێکی ڕۆحی و قەلبییە بۆ موحەمەد و ئەو ئایینەی لای زاتی خوداوە هێناویەتی، لە ڕوانگەی

ئەم تەسلیمبوون و موحیببەتە رۆحیەوەیە کە فەرمووەدەکان شایستەی تێفکرین و قووڵبوونەوەن واتە دەبێت بە ڕستەیەکی ئاسایی و سادەی وەرنەگرین کاتێك پێغەمبەر دەفەرموێت "ئیمانی تەواو نییە ئەو کەسەی منی لە فلاّن و فلاّن و فلاّن خۆشتر نەوێت".

گەر جارێکی تر مێژوو بخوێنینەوە بەوە دەگەین کە حەکیمەکان و ژیرە پیاوەکان و ئیمان مەزنەکان هەر ئەوانە بوون کە نەفەسێکی عیشقی و حوبیانە لە ئیمانیاندا هەبووە ئەمە جگە لەوەی لای کەڵە عارفەکان ئیمان و عیشق وەك دوو شتی جیا لەیەك حساب نەکراون و هەر یەك شت بوون، بەلاّم شەهرام گیان بزانە من نامەوێت ئەوە بڵێم کە عارفەکان دوورن لە عەقڵ و فەیلەسوفەکانیش لە عیشق دوور، نا هەرگیز ئەمە قسەی من نییە چونکە نە عارفێکمان هەیە ڕۆژێك لە ڕۆژان گومانێکی نەبووبێت نە خاوەنی فەیلەسوفێکیشین ڕۆژێك عاشق نەبووبێت تەنانەت عارف بوون و فەیلەسوف بوون و بوون بە حەکیم بەبێ ئەو دوو حاڵەتە لە شتە موستەحیلەکانە.

شەهرام گیان درەختی ئیمان و هەموو ئەو لقانەیشی پێوەیەتی تێکرا بۆ گەیشتنی ئیماندارەکەیە بە سەعادەتی ڕۆحی و خۆشحاڵبوونی مەعنەوی و حەقیقی، ئەوەش بڵێم مرۆڤ بە غەیری ئیمانیش دەتوانێت بگات بە سەعادەت و کەیفخۆشی، بەلاّم ئەو سەعادەتەی مرۆڤ لە غەیری ئیمانەوە پێی دەگات شتێکی

ڕۆحی نییە واتە ئەو سەعادەتە نییە کە تا بەقا و تا ئەبەد هەر سەعادەت بێت، بەڵکو ئەمە کەیفخۆشبوونی بەشە نەفسانییەکەی مرۆڤە هەڵبەتە هەموو بەشە نەفسانییەکەیشی نا، بەڵکو لە ناو نەفسیشدا ئەو بەشەی کە تەواو چڵێس و قێزەون و بەدخووە واتە ئەو بەشەی نەفس کە خۆشیەکانی کورت خایەن و فانی و لەناوچوون نەك هەر فانی و لەناوچوون، بەڵکو لە ئاخیرەتداو لە وەختی حساب و کیتابدا ئەو خۆشیانە دەگۆڕێن و دەبنە ئازاری حەیاشکێنەری مرۆڤ. بۆیە ئیمان بە تەواوی ئەو مەعنایەی لە دەقە نازڵبووەکاندا بەیان بووە پایەیەکی هەرەگەورە و بنچینەیی کامڵکەری ڕۆحی مرۆڤە جا ئەو وەختەی ئیماندارێك لەگەڵ هەنگاونانە ئیمانییەکانیدا ناگات بە لەززەتی کامڵبوونی ڕۆحی ئەوە یان هەنگاوهەڵگرتنە ئیمانییەکانی زۆر کورتخایەنن یاخود نەوەکو هەر هەنگاوەکانی کورت و چکۆلەن، بەڵکو پێدەچێت هەنگاوەکان هەر ئیمانی نەبن و لادان بن لەو مەعنایەی ئیمان کە بۆ کەماڵی ڕۆحی مرۆڤە، وە بەشێکی دیکەی قسەکە ئەوەیە ئەگەر مرۆڤ عەمەل و کردەوەکانی خۆی بە پێی دەستوور و ڕێسا ئیمانییەکان ڕێك نەخات و پراکتیك نەکات ئەوا ئەو مرۆڤە لە ئیمان ترازاوە یان ئەگەر شیاوی وتن بێت "لەو ساتەدا ئەو مرۆڤە لە ئیمان خاڵییە" جا چۆن ئیمان و پڕبوونی مرۆڤێك لە ئیمان وەك پایەیەکی کامڵبوونی ڕۆحی حسابی بۆ دەکرێت بەو جۆرەش خاڵی بوونەوەی مرۆڤ لە ئیمان یەکێکە لە پایە سەرەکی و

بنچینەییەکانی کامڵبوونی بەشە چلێس و قێزەون و بەدکارەکەی مرۆڤ، بەدەر لەمەیش ئیمان نەك هاوکارو یارمەتیدەری مرۆڤە بۆ گەیشتن بە کەماڵی ڕۆحی، بەڵکو ئەوەش ڕیوایەت کراوە کە ئیمان دابەش دەبێت بەسەر گشت پارچەکان و ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤدا.

لەم کاتەدا دەنگێك لە منارەی مزگەوتەکەوە هات، هاواری دەکرد:

ئاگاداری ... ئاگاداری ... منداڵێکی پێنج ساڵان کە جلێکی شینی لەبەردایە ون بووە ڕەحمەت لەوەی دەیدۆزێتەوە و دەیهێنێتەوە بۆ مزگەوت "خوای گەورە چاکەی چاکەکاران ون ناکات". سێجار بەسەریەکەوە ئەم ئاگاداریە وترایەوە.

ماموستا وتی: کاکە شەهرام هەستە با بڕۆین ئەوەندەی لەسەر ئێمە ئەرکە ئەم چەند کۆڵانەی دەوروبەرمان بگەڕێین.

هەرچەندە کارەکە بەلامەوە زۆر ئاسایی نەبوو ئاخر من چەندین جاری دیکە ئەمجۆرە ئاگاداریانەم لە مزگەوتەکانەوە بیستبوو، بەڵام هیچ گوێشم پێ نەدابوو، هەرچۆنێك بێت وتم: زۆر باشە ماموستا با بڕۆین، ئیتر هەستاین و لە ئاوی ئەو تەرمۆزە چواردەور فافۆنەی کە لە بەشی خوارەوەی ژوورەکە دانرابوو هەریەکە و جامێك ئاومان خواردەوەو بەرەو دەرەوە چووین لە بەردەرگاکەوە بەلای ڕاستدا بەڕێکەوتین تا چوار بۆ پێنج کۆڵان ڕۆشتین، بەڵام وەك شتێك نە منیش و نە ماموستاش ورتەمان لێوە

نەدەهات و بە بێدەنگی و چاوگێڕانەوە ڕێمان دەکرد تا ئەوەی لە ناوەڕاستی کۆڵانێکدا بووین دەنگێك لە منارەی مزگەوتەکەوە هات، دەیوت:

ئاگاداری ... ئاگاداری ... منداڵەکە دۆزرایەوە "خوای گەورە جەزای هەموو لایەك بداتەوە" دووجار ئاگاداریەکە وترایەوە، لەم کاتەدا مامۆستا لەگەڵ بەرزکردنەوەی چاوەکانی ڕووەو ئاسمان زۆر بە دەنگێکی نزم و لەسەرخۆ سوپاسی خودای کرد، ئیتر بە دڵێکی شادەوە بەرەو ماڵەوە گەڕاینەوە کە گەیشتینەوە ماڵەوە بەرلەوەی بچینەوە بۆ ئەو ژوورەی کە پێشتر لێی دانیشتبووین لەسەر داوای من لە ناو چیمەنی حەوشەکەدا کەمێك دانیشتین و مامۆستاش چوو لە ژوورەوە دوو پەرداخ شەربەتی مێوژی هێنا و خواردمانەوە، دواتر من وتم:

_ دەزانیت مامۆستا ئەمە بۆ یەکەم جارە بە گوێگرتن بۆ باسی ئیمان تووشی ئەو ئاڵۆزی و تێکچوونە نەبم کە پێشتر تووشی دەبووم تەنانەت ئەمجارە حەز و شەوقێکی زیاد لە ڕادەم تیا دروست بووە بۆ گوێبیستبوونی ئەو قسانە، باوەڕ بکە مامۆستا لەبەر حەز و تامەزرۆیم بۆ قسەکان دەمویست پێت بڵێم با نەچین بۆ گەڕان بەدوای منداڵەکەدا بەڵام شەرمم دەکرد پێت بڵێم.

+ شەهرام گیان چۆن باسکردنی ئیمان پێویستە لەسەرمان گەڕان بەدوای ئەو منداڵەشدا هەر بەو جۆرە بوو جا لەگەڵ ئەوەی بەهۆی گەڕان بە دوای منداڵەکەدا ئیسراحەتێکیشمان کرد خۆی لە

خۆیدا کارەکە بەشێك بوو لەو ئیمانەی باسمانکرد بۆیە جوان نییە کەسێك کە کوێرو نابینایە داوا لە کەسێکی تر بکات وێنەیەکی بۆ بکێشێت بۆئەوەی لێی وردبێتەوە، لە دەستیشمان دەرنەچووە هەرکاتێك تۆ بتەوێت دەست بە باس و خواسی ئیمان دەکەینەوە.

_ جا مامۆستا گیان مەگەر لە ئێستە گونجاوتر هەیە، زۆرم پێخۆشە هەر ئێستە دەست پێبکەینەوە ئەگەر تۆ پێت باش بێت.

ئیتر ئەوە بوو چووینەوە ژوورەوەو مامۆستا وتی:

باسمان لەوە دەکرد ئیمان یەکێکە لە پایە بنچینەییەکانی کامڵبوونی ڕۆحی مرۆڤ جا شەهرام گیان ئەم مەسەلەی سەرقاڵبوونی ئیماندار بە کامڵکردنی ڕۆحی خۆیەوە بابەتێکی زۆر داواکراوە و بە قیمەتە بۆیە ئەگەر بە وردی مێژووی مرۆڤایەتی ئێستەشی لەگەڵدابێت بخوێنینەوە "مەبەستم گشت مرۆڤایەتییە بە هەموو ئایینەکانەوە" ئەوا دەگەین بەوەی زۆربەی حەکیمەکان و مرۆڤە ڕۆحانییە مەزنەکان بەهۆی بەگەورەزانینی کامڵبوونی ڕۆحی خۆیان و سەرقاڵبوونیان بەم کارەوە دەستیان هەڵگرتووە لە کۆمەڵێك لە ڕوکنەکانی دیکەی ژیانی خۆیان و فەرامۆشیان کردووە و بە چاوی بایەخدارییەوە بۆیان نەڕوانیوە، تا ئەوەی خودا لەم بابەتی خۆگەیاندن بەکەماڵی ڕۆحی ڕاستەوخۆ ئیماندار ئاگادار دەکاتەوەو وریایی دەداتێ ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ﴾ (١٠٥ المائدە) "ئەی خاوەن ئیمانەکان ئاگاتان لە

کردەوە و ئیمانی خۆتان بێت" خودا بەتەواوی مەعنا بە ئیماندار دەفەرموێت ئاگاداری ئیمانی خۆت بە.

منیش لەم کاتەدا بە پەنجە ئاماژەم کرد بۆ یەکێك لە وێنەکانی سەر دیواری ژوورەکە، ئەو وێنەیەی کە بریتی بوو لە ڕوخسارێکی تەواو پڕ سام و هەیبەت وە لە ژێر وێنە بەدەست کێشراوەکەی ڕوخسارەکەدا پەیامێکی چەند دێڕی نووسرابوو لە ژێر پەیامەکەشدا لای چەپەوە لە ناو دوو نیوە کەوانەدا نووسرابوو سەعیدی نوورسی، وتم:

– مامۆستا بیرت ماوە جارێکیان بە منت وت یەکێك لەو پیاوە مەزنانەی کە بە هۆی پەیامەکانییەوە فریای من کەوت و گۆڕانکاری ڕۆحی مەزنی بەسەر مندا هێنا ئەم پیاوە بوو، دواتریش ئەوەت فەرموو کە کۆی نووسین و کۆششی ئەم پیاوە بە مەبەستی ڕزگارکردنی ئیمانی خەڵك بوو؟

+ بەڵێ کاکە شەهرام زۆر باشم لە بیرە.

_ بەڵام ئەوەتا خودا بە ئیمانداران دەفەرموێت "ئاگاتان لە ئیمانی خۆتان بێت"؟

ئیتر مامۆستا سەیرێکی وێنەکەی کردو بە ڕوویەکی شادی بەخشەوە سەرەلەقەیەکی کرد، پاشان وتی:

بەڵێ ئەم پیاوە پڕ لە ئیمانە ئەوەندە لە خەمی ڕزگارکردنی ئیمانی خەڵکدا بوو کە زۆر وەخت بە قووتابییەکانی دەوت "بەهەشتیش پلە بە پلەو مەقام بە مەقامە جا یەکێك لە بەندایەتی

و عیبادەتە جوانەکان ئەوەیە ئیماندار لە نزمترین پلەو مەقامی بەهەشتدا شوێنێك بۆ خۆی مسەوگەر بکات، بەڵام دواتر لەبری هەوڵدان بۆ بڕینی مەقامەکان و خۆگەیاندن بە بەرزترین مەقامی بەهەشت، دەستی یارمەتی و بەرپرسیارێتی ڕووەو دۆزەخیەکان درێژ بکات و دەستیان بگرێت تا دەیانگەیەنێتە خوارترین مەقامی بەهەشت و لە دۆزەخ ڕزگاریان دەکات" جا بە تێفکرین و وردبوونەوە لەم پەیامەو لەم ئەرکە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت ئەم کارە خۆی لە خۆیدا بڕینی مەقامەکانی بەهەشتیشە، بەڵام شەهرام گیان خەریکبوونی ئەم پیاوە بە ڕزگارکردنی ئیمانی مرۆڤەکانی دیکەوە بریتی نییە لە وازهێنان لە ئیمانی خۆی، نا، بەڵکو بە ویستی خودا ئەم پیاوە هەر بە زوویی خۆی لە نووری ئیمان پڕکرد ئەوەندە پڕ کە نووری ئیمانی ئەم بەسە بۆ نوورانی بوونی هەر قەومێك ئەگەر خۆیان بیانەوێت.

شەهرام گیان ئەوەمان باسکرد ئیمان یەکێکە لە پایە بنچینەییەکانی کامڵبوونی رۆحی ئینسان وە بەر لەمیش ئەوەمان وت کە ئیمان و مەعریفە یەك شت نین، بەڵکو ئیمان بۆخۆی بابەتێکە و مەعریفەش بابەتێکی دیکەیە، بەڵام یەك نەبوونی ئیمان و مەعریفە ناکاتە ئەوەی ئەم دووانە دژو پێچەوانەی یەکدی بن، بەڵکو لە زۆر قۆناغدا ئیمان پێویستی بە مەعریفە هەیە، هەروەك چۆن "ئاو" و "شەربەت" یەك شت نین، بەڵام بۆ دروستکردنی شەربەت ئیللا پێویستمان بە ئاو هەیە "ئەسڵەن بەبێ بوونی ئاو

شەربەتێك بوونی نییە" جا ئەوە ڕاستە کە ئیمان و مەعریفە یەك شت نین، بەڵام پەیوەندییەکی تەواو بەهێز لە نێوانیاندا بوونی هەیە بۆیە ئیمانداریکی خاوەن مەعریفە کە شانبەشانی ئەو مەعریفەیەی هەیەتی باڵای ئیمانی خۆی بەرز دەکات لای خودا زۆر قبوڵتر و لەپێشترە لە ئیمانداریکی خاڵی لە مەعریفە، تەنانەت ئەو ڕێسایەشمان هەیە کە چۆن عیلمی بێ عەمەل باخی بێ بەرە هەر بەو جۆرەش عەمەلی بێ عیلم و کردەوەی خاڵی لە مەعریفە و نییەت نزیکە لە مایەپووچی.

_ مامۆستا ئەگەر ئیمان و مەعریفە پەیوەندییەکی بەهێز لە نێوانیاندایە و لە زۆر قۆناغدا ئیمان پێویستی بە مەعریفە هەیە، کەواتە مەعریفە خۆی چییە؟

+ شەهرام گیان لەبری ئەوەی ڕاستەوخۆ پێناسەی مەعریفە بکەین باشترە پێشتر باس لە سەرچاوەکانی مەعریفە بکەین، ئەوانیش بە شێوە گشتیەکەی بریتین لە دووان واتە دوو سەرچاوەی مەعریفەمان هەیە "یەکەمیان: بریتیە لە هەستەکان" وە "دووەمیان: بریتیە لە عەقڵ و ڕۆح" لە ناو فەیلەسوفەکانیشدا لایەنگر و شوێنکەوتەی هەریەکێك لەم دوو بۆچوونە بوونیان هەیە واتە گروپێك لە فەیلەسوفەکان باوەڕیان وایە ئەوە هەستەکانن بوونەتە سەرچاوەی مەعریفە بۆ مرۆڤ بەو واتایەی "مرۆڤ لە ڕێی هەستەکانەوە دەتوانێت ببێتە خاوەنی مەعریفە" بۆنمونە (ئەو کاتەی مرۆڤ دەستی بەر ئاگر دەکەوێت ئیدی لەو ساتەوە دەبێتە

خاوەنی ئەو مەعریفەیەی ئاگر و گەرمی دەست دەسوتێنێت) وە هەندێك لە فەیلەسوفەکانی ناو ئەم گرووپە بەرامبەر بە بایەخی هەستەکان تا ئەو ڕادەیە تووشی سەرسوڕمان بوون کە دەڵێن هەستەکان تاکە سەرچاوەی مەعریفەن. بەڵام لە هەمان کاتیشدا کۆمەڵ و گروپێکی دیکە لە فەیلەسوفەکان بۆچوونیان وایە "عەقڵ و ڕۆح سەرچاوەی مەعریفەن" هەرچەندە ئەمان بەهۆی ئینساف و میانڕەوییانەوە بایەخ و کاریگەری هەستەکان لە پرۆسەی بەدەستهێنانی مەعریفەدا ڕەد ناکەنەوە، بەڵام مەعریفەی ڕاستەقینە بە بەرهەمی چالاکییە عەقڵیەکان و ئەزموونە ڕۆحیەکان دەزانن چونکە مەعریفەی ڕاستەقینە ئەوەیە ئەگەر هەر خەسڵەت و تایبەتمەندیەکیشی هەبێت دواجار دەبێت شایەنی ئەوەی هەبێت مرۆڤ لێی تێبگات ئەمە لە کاتێکدا بەشێك لە شتە جەوهەری و وجودیەکان هەروا شتانێکی سادە و بەرجەستە نین تا من بێم لە ڕێی هەستەکان و مەعریفەی هەستییەوە کەشفی بکەم، بۆنمونە مەعریفە هەستییەکان چییان پێدەکرێت بۆ ناساندنی خودا؟! هەستەکان جگە لە دەستەوسانی لەبەردەم عیشقدا چی دیکە دەتوانن؟! واتە هەستەکان لە کاتێکدا خۆیان بەرجەستەن ئیدی بێ توانان لە ئاست کەشفکردن و ناساندنی ڕاستەقینە مەعنەوی و عەقڵیەکاندا، بەڵام دەتوانین ئەوە بڵێین چۆن لە نێوان ئیمان و مەعریفەدا پەیوەندی هەیە لە نێوان مەعریفەی هەستی و مەعریفەی عەقڵی و ڕۆحییشدا پەیوەندی هەیە پەیوەندییەکەش بەم شێوەیە "هەستەکان کەرەستەی مەعریفە دروست دەکەن دواتر

عەقڵ و هۆش و بیرکردنەوە ئەو کەرەستانە دەکەن بە شتێکی ڕوون کە بریتیە لە مەعریفە" واتە هەستەکان بە تەنها لە توانایاندا نییە ببنە دایك و منداڵێك بخەنەوە ناوی مەعریفە بێت بۆیە مەعریفەی ڕاستەقینە زیاتر نزیکە لە عەقڵەوە، هەندێکجار مەعریفەی عەقڵییش هەرچەندە لەدایکبووی عەقڵ و ژیرییە، بەڵام بۆئەوەی لێی تێبگەین و کەشفی ڕازەکانی بکەین تەنها ئەوەندە بەس نییە عەقڵ و بیرکردنەوەی بۆ بخەینە کارو تەواو، بەڵکو لەم حاڵەتەدا دەبێت مرۆڤ بە شتێکی دیکە هەوڵی کەشفکردنی ڕازەکانی ئەم جۆرە مەعریفەیە بدات ئەو شتەش بریتیە لە ئەزموون "تجروبە" وە ئەزموون جگە لەوەی وامان لێدەکات بزانین، باشییەکی دیکەشی هەیە ئەویش ئەوەیە فێری ناسینیشمان دەکات واتە هەرکەسێك تەریقەتی ئەزموون بکاتە ڕێگەی خۆی وە ببێتە پیادەی ئەو ڕێگەیە ئەوە تەنها شتەکان نازانێت، بەڵکو شتەکانیش دەناسێت، کە زانینی بێ ناسین تا ئەوپەڕ جیاوازە لەگەڵ زانینێك ناسینی لەگەڵدایە " چەندە زۆرن ئەو مرۆڤانەی دەزانن خودا هەیە، بەڵام نایناسن لە کاتێکدا ئامانج لە دروستکردنی مرۆڤ بریتیە لە ناسینی خودا" بۆیە چەند شتێك هەن تەنها ئەوەندە بەس نییە تۆ بیانزانیت، بەڵکو دەبێت بیشیانناسیت، ڕێگەی ناسینیش پێشتر وتمان بریتیە لە ئەزموون "خوێندنەوەی چەندین کتێب دەربارەی عیشق ئەوەندەی ساتێك عاشقبوون ڕازەکانی عیشقت بۆ کەشف ناکات".

شەهرام گیان ئەگەر ئیمان بریتی بێت لە سەربانێك وە

مەعریفەش پەیژەکەی بێت ئەوا بۆ چوونە سەربان ئەوەندە بەس نییە بزانیت پەیژەیەك بوونی هەیە، بەڵکو دەبێت پیایدا سەربکەویت چونکە ئیمان لە سەروو مەعریفەوەیە، وە وردترین و گرنگترین خاڵ لەم بابەتەدا ئەوەیە هەموو پەیژەیەك بە کەڵکی ئەوە نایەت پیایدا سەربکەویت، پەیژەی وا هەیە ئەوەندە نامەحکەم و بێکەڵکە ئەگەر بچیتە سەری نەك ناتگەیەنێتە سەربان، بەڵکو بە شێوەیەك دەتخاتە خوارەوە لە پەل و پۆت دەخات بۆیە ئیدی نەك چوونە سەربان، بەڵکو بە خەیاڵکردن و بە ناوبردنی سەربانیش قەڵس دەبیت، کاتێك ژیرە پیاوەکان و عارفەکان دەڵێن "مرۆڤ با سەیری خواردنەکەی بکات" ئەوا دەبێت ئەوەمان لە یاد بێت مەعریفەش خۆراکە وە هەموو خۆراکێکیش بەرلەوەی بیخۆیت چەند هۆکارێك هەیە بۆ ئەوەی بزانیت پاکە یاخود پیس.

کاکە شەهرام پرسیارێك لە پرسیارە زۆر گرنگەکان کە دەبێت لەم ساتەدا بکرێت و وەڵام بدرێتەوە ئەو پرسیارەیە کە خۆت لە ناو دەفتەرەکەدا نوسیوتە، دەڵێیت "لە ئەمڕۆدا یان دەبێت ئیماندارێکی تەقلیدی و کلاسیکی بیت (دوور بیت لە مەعریفە) یاخود دەبێت خاوەن مەعریفە بیت و دوور بیت لە ئیمان، ئەمە بۆچی؟" شەهرام گیان ڕاستییەکەی ئەوەیە کە ئیمانداربوون داوای مەعریفە دەکات، بەڵام پرسیارەکە ئەوەیە "کام مەعریفە؟".

تێگەیشتن لە هەرشتێك مەرج نییە یەکسان بێت بە خودی شتەکە بۆیە ئەگەر وا تێگەیشتبین بوون بە ئەهلی مەعریفە و دەستخستنی مەعریفە پێویستی بە لەدەستدانی ئیمانە یان

ئیمانداربوون پێویستی بە دەستهەڵگرتنە لە مەعریفە ئەوا تێگەیشتنی ئێمە لە جێی خۆیدا نییە نەك ئەوەی خودی بابەتەکە بەمجۆرە بێت.

جا بۆئەوەی وەڵامی ئەو پرسیارەی سەرەوە بدەینەوە کە دەڵێین "ئیمانداربوون و بڕینی مەقامە ئیمانییەکان داوای مەعریفە دەکات، بەڵام پرسیارەکە ئەوەیە کام مەعریفە؟" ئەوا دەبێت پێشتر شتێکی دیکە ڕوون بکەینەوە، ئەویش ئەوەیە ئەگەر بە وردی لە ژیانی مەعریفی ڕابمێنین و خوێندنەوەیەکی بەدیقەتانە بۆ ژیانی مەعریفیانە بکەین دەگەین بەو ڕاستیەی کە بنچینەو بناغەی ژیانی مەعریفی دوو پایەیە، ئەوانیش بریتین لە (عەقلانییەت و مەعنەویەت) یاخود دەتوانین بڵێین پایە سەرەکییەکانی مەعریفە بریتین لە (عەقڵ و ڕۆح) بەڵام لە ئێستادا مرۆڤەکان مەعریفەی خۆیان پارچە پارچە کردووە واتە ئەمڕۆ مرۆڤەکان بۆ ژیانی مەعریفییان تەنها پشت بە یەکێك لەم دوو پایەیە دەبەستن کە ئەمە هەڵەیەکی گەورەی مەعریفییە مرۆڤایەتی تێیکەوتووە، بەڵام لەم هەڵەیە گەورەتر بریتیە لە هەڵە کوشندەکە ئەویش ئەوەیە هەردوو پایە سەرەکییەکە "عەقلانییەت و مەعنەویەت" وەلا بنرێت و مرۆڤ خۆی تەرخان بکات بۆ خزمەتی بەشە ئاژەڵیەکەی خۆی لە ڕێی مەعریفەی نەفس ووروژێنەوە. ئەم بەش بەش بوون و پارچە پارچە بوونە مرۆڤ بە هیلاك دەبات تەنانەت هەندێکجار مرۆڤ تووشی ڕەنج بەخەساری دەکات.

_ بمبورە ماموستا، ئەگەر بکرێ ئەم بەشەی قسەکانت زیاتر

ڕوون بکەیتەوە.

+ شەهرام گیان بۆنمونە بە تەنها قبوڵکردن و پشتبەستن بە مەعریفەی عەقڵی و فەلسەفی بۆ بنچینە و بناغەی ژیانی مەعریفی کارێکی زۆر ژیرانە نییە، چونکە لە تەمەنی مەعریفی مرۆڤدا گرێ کوێرەی وەها دروست دەبێت ئەگەر بمانەوێت بە تەنها بە مەعریفەی عەقڵانی و فەلسەفی بیکەینەوە ئەوا بە هەڵەدا چووین، بۆیە دەبینین پیاوی عەقڵانی و فەیلەسوفی وا هەبووە بە یەکجاری دەستی لە مەعریفە هەڵگرتووە و وازی لێ هێناوە چونکە ئەم وایدەزانی تەنها مەعریفە عەقڵانی و فەلسەفیەکان دەبنە دەوا بۆ گشت دەردێك، بەڵام لە ڕاستیدا هەر دەردێك دەوای خۆی هەیە. ئەم قسەیە تەنها بۆ مەعریفەی عەقڵانی و فەلسەفی ڕاست نییە، بەڵکو بۆ مەعریفە ئیمانی و ڕۆحیەکانیش هەر ڕاستە، واتە چۆن بە تەنها مەعریفە عەقڵانی و فەلسەفیەکان بەس نین بۆ قۆناغەکانی ژیانی مەعریفی مرۆڤ ئەوا بەهەمان شێوە بەتەنها مەعریفە ئیمانی و ڕۆحیەکانیش بەس نین بۆ قۆناغەکانی ژیانی مەعریفی مرۆڤ، چونکە گرێ کوێرەی عەقڵی وا هەیە ئەگەر هەموو مەعریفەی ئیمانی و ڕۆحی بێنیت توانای کردنەوەی ئەو گرێیەی نییە، بۆیە ئەوە ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگرە کە ئێمە لە ژیانی مەعریفیماندا بۆ پڕکردنەوەی فەراغە ڕۆحیەکان نیازمەندین بە مەعریفەی ڕۆحی وەك چۆن بۆ فەراغە عەقڵیەکانمان نیازمان بە مەعریفەی عەقڵی هەیە.

لە مەعریفەدا ئەوە تەنها مەعنەویەت نییە فریای مرۆڤ دەکەوێت وە فیکریش بە تەنها لە توانایدا نییە مرۆڤ ڕزگار بکات، بەڵکو "فیکر و مەعنەویەت" پێکەوە دەبن بە کەشتی نەجاتدەری مرۆڤ، ئەگەر مرۆڤ هەر نان بخوات و واز لە ئاو بێنێت ئەوا ڕۆژێك لە تاو تینوێتیدا دەخنکێت وەکو چۆن بە تەنها خواردنەوەی ئاو و وازهێنان لە نان مرۆڤ دەکاتە دیلی برسێتی و دەیکوژێت. بۆیە نە فەیلەسوف پەروەردەکردنەکەی ڕۆژئاوا فریای مرۆڤایەتی دەکەوێت نە فەقیهـ پەروەردەکردنەکەی ڕۆژهەلات، بەڵکو مرۆڤایەتی پێویستی بە حەکیم هەیە واتە دەبێت نان و ئاوەکە هەم بۆ ڕۆحی مرۆڤەکان بێت وە هەم بۆ عەقڵیشیان، جا وەها مەعریفەیەکیش کە هەم بۆ عەقڵ بێت وە هەم بۆ ڕۆح پێیدەوترێت حیکمەت، بۆیە بەدەر لە مەعریفە ئەگەر بۆ لایەنەکانی دیکەی مرۆڤایەتیش بڕوانین ئەوا دەبینین مرۆڤەکان تەنها بە عەقڵ پێش ناکەون هەروەکو چۆن بە تەنها عیشقیش نابێتە پێشخەری مرۆڤ کە ئەمە دیسانەوە ئەو ڕاستییەمان پێدەڵێت مرۆڤایەتی پێویستی بە حەکیم هەیە چونکە حەکیمەکان بە ئەندازەی عاقڵبوونەکەیان عاشقیشن.

جا شەهرام گیان پێشتر وتمان ئیمانداربوون داوا لە مرۆڤ دەکات شوێن مەعریفە بکەوێت و مەعریفە بەدەست بێنێت، بەلام پرسیارەکە ئەوە بوو کام مەعریفە؟ جا ئێستە دەتوانین بلێین ئەو مەعریفەیەی کە تەنها مەعریفەیەکی عەقڵی نییە وە ئەو مەعریفەیەش کە تەنها مەعریفەیەکی ڕۆحی نییە، بەڵکو لە بازنەی

ئیماندا داوا لە ئیماندار دەکرێت ببێتە شوێنکەوتە و کارپێکەری مەعریفەیەك کە هەم ڕۆحیە و هەم عەقڵیش، واتە ئیماندار پێویستی بە حیکمەت هەیە.

ئەگەر مەعریفەیەك تەنها بریتی بێت لە زانین کە بەشێکی زۆری مەعریفەی ئەم سەردەمە "سەردەمی مۆدێرنە" وەهایە ئەوا ڕۆح و گیانی مرۆڤ تێر ناکات، بەڵکو مەعریفەیەکی لەم جۆرە تەنها دەبێتە خۆراك بۆ عەقڵی ئامرازی وشك.

((( مەعریفەیەك دەبێتە خۆراك بۆ عەقڵ و ڕۆح کە مەقامی زانینی جێهێشتبێت و کاری ناسین بۆ مرۆڤ ئەنجام بدات، لە ڕاستیدا ئیمانیش هەر ئەمەیە، واتە "بە ئیمان شتەکان دەناسرێن، بە ئیمان ونبووەکان کەشف دەبن، بە ئیمان نادیارەکان دێنە پێش چاو" کەسێکی وەکو مەنصوری حەللاج لە ڕێی ئیمانەوە "کە ئیمان و عیشق لای عاریفەکان یەك شتە" شتانێکی وای بۆ کەشف بووبوو کاتێك قسەی لێوە دەکرد ئەوانی تر بە بێ ئیمان ناویان دەبرد، بۆیە زۆرجار ئیماندارەکان "عاشقەکان" گەورەترین گرفتیان ئەوەیە مرۆڤەکانی دیکە لێیان تێناگەن چونکە ئیمان چاوی قەلبی ئیماندار دەکاتەوە لە کاتێکدا چاو لای مرۆڤەکانی دیکە تەنها ئەو دوو چاوەیە کە بە سەری مرۆڤەوەیە. )))

جا کاتێك باسی ئیمان دەکرێت و لەگەڵیشیدا مەعریفە.بە زیادکەری ئیمانی ئیماندارەکان باس دەکرێت، ئەوا حەتمەن دەبێت ئەو مەعریفەیە بێت کە بریتیە لە ناسین نەك ئەو مەعریفەیەی تەنها زانینەو بەس. چونکە چۆن مەعریفە دەوری

زیادکردن و پاڵفتەکردنی ئیمان دەگێڕێت، ئەوا زۆر ئەگەرێکی کراوە و مومکینە کە هەر مەعریفە دڵ لە ئیمان خاڵی بکاتەوە یاخود دڵ پڕ بکات لە وەسوەسە و گومان، هەڵبەتە ئەم مەعریفەیە ئەوەیە کە بریتیە لە زانینی ڕووت، هەندێکجار مەعریفەیەکە خوارترە لەمەیش، کەواتە ئیمان بریتی نییە لە زانین بەڵکو بریتیە لە ناسین بۆیە باوەڕی بێ ناسین شتێکی بێ بەهایە لە ئاست ئەو باوەڕەی کە ناسینی لەگەڵدایە.

مرۆڤ لە هەر مەقامێکی ئیماندا بێت نابێت ئەو ڕاستیە لەیاد بکات کە "گۆڕانی مەعریفەو سەرچاوەی مەعریفە گۆڕان لە بوونییەتی مرۆڤدا دەخولقێنێت" بۆیە بۆ گەیشتن بە مەقامی سەرووتر مرۆڤ پێویستی بە مەعریفە هەیە، کەواتە دەبێت لەوێوە دەست پێبکەین کە مەعریفەمان زیاد بکەین، بەڵام هەموان لەسەر ئەوە کۆکن کە خودی مەعریفە بابەتێکی چەندێتی نییە، بەڵکو مەعریفە وەستاوە لەسەر چۆنێتی، بۆیە ئەوە گرنگ نییە ئێمە بەردەوام سەرقاڵی زیادکردنی مەعریفە بین، بەڵکو گرنگ ئەوەیە بەردەوام سەرقاڵی زیادکردنی ئەو جۆرە مەعریفەیە بین کە ڕۆح و عەقڵی ئێمە موحتاجیەتی، هەمووومان دەرکی ئەوەمان کردووە و ئەوە دەزانین کە کتێبخانە و شوێنی کتێب فرۆشەکان پڕن لە کتێب وە ئەوەیش دەزانین ئەم کتێبانە زۆرینەیان بریتین لە مەعریفە، بەڵام گرنگی بابەتەکە لەوێدایە ئایا لە ناو ئەم گشت کتێبەدا و لە ناو ئەم هەمووە مەعریفەیەدا کامەیان ئاوێکی لێدەچۆڕێتە بن درەختی عەقڵ و ئیمانی من.

_ مامۆستا ئایا تەنها بە نووسراو واتە تەنها بەوەی لە ناو کتێبەکاندا نووسراوە و تۆمار کراوە دەوترێت مەعریفە؟

+ شەهرام گیان ئەمەی تۆ دەیڵێیت مەرج نییە، چونکە دەکرێت مەعریفە بەشێکی زۆری ئەو خەبەرانە بێت کە من و تۆ لە رێگەیەکی جیاواز لە رێگەی کتێب خوێندنەوەوە دەیبیستین یاخود دەکرێت مەعریفە بریتی بێت لە وێنەیەك، جا لەبەرئەوەی ئەو خەبەرەی من بە تۆ یاخود تۆ بە منی دەدەیت هەندێکجار بریتیە لە مەعریفە ئەوا دەبێت ئاگادار و وریای ئەو مەعریفانە بین کە پێمان دەدرێت، چونکە مەعریفە وەك ئەو پریشکە ئاوە نییە کە بەر جلەکانت دەکەوێت، بەڵکو مەعریفە وەك ئەو چۆڕە ئاوە وایە کە دەیخۆیتەوە، پریشکێك ئاو تەنانەت ئەگەر زۆر پیسیش بێت با بەر پۆشاکەکەیشت بکەوێت تەنها ئەوەندەیە پۆشاکەکەت پیس دەبێت دواتر زۆر بە سانایی دەتوانیت پۆشاکەکەت پاك بکەیتەوە، بەڵام چۆڕێك ئاوی پیس کە دەیخۆیتەوە ئەگەری ئەوەی لێدەکرێت تووشی چەندین نەخۆشیت بکات، تەنانەت لە هەندێك جۆری نەخۆشیدا ئەگەری کوشتن لە ئارادایە. بابەتی مەعریفەش بە تایبەت ئەو مەعریفەیەی پەیوەندی بە ئیمانی مرۆڤەوە هەیە بەتەواوی هاوشێوەی نمونەی ئەو چۆڕە ئاوەیە، بۆیە هەموو مەعریفەیەك شایەنی وەرگرتنی نییە.

وە ئەو مەعریفەیەی ناومان برد بە حیکمەت "مەعریفەی عەقڵی و رۆحی" تەنها فێرمان ناکات، بەڵکو پەروەردەشمان دەکات، هەروەها ئەو تەرتیبەی لە نێوان پەروەردە و فێرکردنیشدا

هەیە "پەروەردە پاشان فێرکردن" ئەم مەعریفەیە خۆی ڕێکی دەخات، بۆنمونە عارفێك بەرلەوەی ببێتە عارف شتێکی وەرگرتووە "مەعریفەیەکی وەرگرتووە" دەربارەی مەقامەکانی تەریقەت و عیرفان، ئەم وەرگرتنە جۆش و خرۆشی پێداوە تا وای لێکردووە سەرقاڵی بڕینی مەقامەکانی تەریقەت و عیرفان بێت، ئیدی کە مەقامی یەکەم کە بریتیە لە "مەقامی تەوبە"ی بڕی ئەوا بە تەواوی لە مەسەلەی تەوبەکردندا پەروەردە دەبێت "دەبێتە کەسێك کە تەوبەی کردووە" جا ئەمە لە تەرتیبی "پەروەردەو فێرکردن"دا بریتیە لە بەشی یەکەم کە پەروەردەکردنە، پاش ئەمە نۆرە دێتە سەر بەشی دووەم کە فێرکردنە، بەڵام ئەوە شتێکی ڕوونە ئەگەر کەسێك بە عەمەلی ئەزموونی تەوبەکردنی کرد ئەوا بە چاکیش ئەوە فێردەبێت و دەزانێت تەوبەکردن چییە. ئەم تەرتیبە "پەروەردە پاشان فێرکردن" هەروا شتێکی سادەو کەم قیمەت نییە، چونکە ئەگەر بێتوو پێچەوانە بێتەوە واتە "فێرکردن پاشان پەروەردە" ئەوا تووشی گەورەترین دەرد دەبینەوە و پێوەی دەتلێینەوە کە بریتیە لە بێ پەروەردەیی و پەروەردە پووچی، ئەمە ئەو دەردەیە بەشێك لە وڵاتە بە ڕواڵەت پێشکەوتووەکان پێوەی دەتلێنەوە.

بەدەرلەوەی وتمان، ئیمان نوورە و نووری ئیمانیش لەو دڵانەدا دەدرەوشێتەوە کە خاوەن دڵەکە بە بێداری ژیان دەکات، هەڵبژاردنی تەریقەتی بێداریش واتە شوێنکەوتنی مەعریفە و باوەڕبوون بە مەعریفە، بەڵام هەر مەعریفەیەك ڕێگای گەیشتن بە

خودا دوور بکاتەوە ئەوە مەعریفەیەکە بە کەڵکی ڕۆحی مرۆڤ نایەت، چونکە مرۆڤ هەر لە سەرەتاوە بە هۆی جەهل و نەزانییەوە لە خودا دوورکەوتەوە، جا ئیتر ئەوە چ مەعریفەیەکە ڕێگای گەڕانەوەمان بۆ لای خودا لێ درێژ دەکاتەوە، ئەوە مەعریفەیە مرۆڤ لە غەفڵەت و بێ ئاگایی دێنێتە دەرەوە و بە یەکجاری باری غەفڵەت لەسەر کۆڵی مرۆڤ دادەگرێت و ئەو مرۆڤە دەخاتە سەر سکەی عیشق و ئیمان، ئەوە مەعریفەیە کە مرۆڤ دێنێتە دەرەوە لە بازنەی ئایەتی ( لم تقولون مالا تفعلون ) واتە مەعریفە بریتی نییە لە قسەی زل زل، مەعریفەیەك ئەگەر مرۆڤ فێری بتشکێنی نەکات هەر وازی لێ بهێنرێت چاکترە، ئەگەر دین بۆ ئەوە هاتووە مرۆڤ لە کۆیلایەتی ڕزگار بکات و بیکات بە مرۆڤێکی ئازاد و سەربەرز، دەی هیچ دینێك نییە بەبێ مەعریفە توانای ئەنجامدانی ئەم کارەی هەبێت، ئەسڵەن ئایینی بێ کتێب ئایین نییە هەڵبەتە بە حسابکردنی وەحی بە کتێب، دواجار کاری مەعریفە بریتی نییە لە بەختەوەرکردنی مرۆڤ بەڵکو مەعریفە ڕێگاکانی بەختەوەری نیشانی مرۆڤ دەدات، بەڵام لەگەڵ ئەم گشتە باشییەی مەعریفە هەیەتی، دەبێت لەوەش بەئاگابین کە چۆن فەیلەسوفەکان دەڵێن "کەمێك فەلسەفە عەقڵی مرۆڤ پەك دەخات، بەڵام قوڵبوونەوە لە فەلسەفەدا عەقڵ بەرەو کەماڵ دەبات" ئەم قسەیەی فەیلەسوفەکان لە سوننەتی عیلم و مەعریفەشدا بە هەمان شێوەیە چونکە هەندێکجار نەزانینی عیلم و مەعریفە بۆ مرۆڤ یارمەتیدەرترە لەوەی تەنها نەختێکی کەم بزانێت.

دوای چەند ڕۆژێك گەیشتم بەو بەروارەی کە بڕیار بوو بۆ شەوەکەی بچم بۆ مەخزەنی دوکانەکەی باوکی غەزالی و وەکو پاسەوان بمێنمەوە، ڕاستییەکەی مانەوەی شەوانەم لەو مەخزەنە هیچ سەختییەکی تێدا نەبوو تەنانەت هەندێکجار بە خۆمم دەوت "ئەسڵەن ئەم مەخزەنە پێویستی بە پاسەوان نییە" بەڵام باوکی غەزالی پیاوێکی کار مەحکەم بوو بۆیە من و کاك حاجی بۆ پاسەوانی مەخزەنەکە دانابوو، ئەم ئیشە بۆ من نەك هەر سەخت نەبوو، بەڵکو مانەوەی شەوانەم لە مەخزەنەکە ئەوەندە پێخۆش بوو هەندێکجار ئەو شەوانەیش کە نۆرەی کاك حاجی بوو پێمدەوت ئەمشەو تۆ مەیە من لە مەخزەن دەمێنمەوە، ئەم حەزەی من بۆ مانەوە لەو شوێنەدا بەشێکی هۆکارەکەی بۆ ئەوە دەگەڕایەوە لە سروشتی مندا حەزێکی زۆر هەبوو بۆ تەنهایی بە تایبەت لەو قۆناغەی تەمەندا کە زۆر پێویستم بە تەنهایی بوو.

ماوەیەك بەسەر مانەوەی شەوانەمدا لە مەخزەنەکە تێپەڕی

کرد لەو ماوە تێپەڕیوەشدا جاروبار غەزالی دەهاتە لام و تا درەنگانێکی شەو بۆ خۆمان پێکەوە دادەنیشتین و قسەوباسمان دەکرد، لەو شەوانەشدا جارێکیان ماموستا ئەکرەم هاتە لامان تا کاتی نوێژی بەیانی نەخەوتین بڕێك باس و خواسی ئەدەبیمان پێکەوە کرد.

ئێوارەیەکیان کە گەیشتمە مەخزەنەکە و چوومە ژوورەکەی خۆم و کاك حاجی، لەسەر لێواری پەنجەرەی ژوورەکە بینیم زەرفێکی نامە دانراوە کە نزیك بوومەوە و تەماشام کرد بینیم زەرفی نامەکە هێشتا نەکراوەتەوە واتە بە کەپسکراوی دانرابوو، بەڵام وازم لێ هێناو وتم لەوانەیە بۆ کاك حاجی دانرابێت با من دەستکاری نەکەم، ئیتر چووم تەماشایەکی ناو مەخزەنەکەم کردو گەڕامەوە بۆ ژوورەکە، نەمزانی هۆکارەکەی چی بوو بەو ئێوارەیە خەوم دەهات هەرچەندە ویستم بەسەر خۆمدا زاڵ بم و نەخەوم هەرچیم کرد نەمتوانی بۆیە وتم با وەنەوزێك بدەم، بەڵکو خەوەکەم بڕوات، ئەوەبوو نزیکەی کاتژمێرێك خەوتم، بەڵام خەونێکم بینی لەو خەونەمدا "منداڵێکی ساوا هاتبوویە قسەو دەیوت ئەو نامەیە بۆ تۆ هاتووە" منداڵەکە سێجار ئەم قسەیەی دووبارە کردەوە، لەم کاتەدا لە خەوەکەم ڕاپەڕیم و بەخەبەر هاتمەوە، بەڵام هەستم بە ترسێکی زۆر دەکرد بۆیە نەمدەوێرا زەرفی نامەکە بکەمەوە بە خۆیشم دەوت باشە ئەگەر بۆ بینینی ئەم خەونە نەبوایە کەی ئێستە بەم سەرەتای شەوە کاتی خەوە، ئیدی پاش کەمێك

بڕیارمدا زەرفی نامەکە بکەمەوە، کە کردمەوە بینیم کاغەزێکی نووسراوی تێدایە بۆیە منیش دەستم کرد بە خوێندنەوەی، نووسرابوو:

(("پیاوێك دەستی نزاو پاڕانەوەی ڕووەو خودا بەرز کردەوە، داوای لە خودا کردو وتی خوایە من نامەوێت ببم بە فریشتە، بەڵام لە مرۆڤبوونی خۆیشم وەڕەس و بێزارم، بۆیە خودا بمگەیەنەرە پلەیەك خوار فریشتەبوون و پلەیەك سەرو مرۆڤبوونیشەوە. خودا فەرمووی ئەی پیاو تۆ داوای بەرپرسیارێتییەك دەکەیت لە توانای خۆت زیاترە، ڕاگەیشتن بەم بەرپرسیارێتییە تەنها بەشێك لە ئافرەتەکان دەرەقەتی دێن.

پیاوەکە وتی دەی باشە خودا نە تاقەتی شاعیربوونم ماوە نە حەزیش دەکەم لەمەودوا ببمە وشەی ناو دێڕە شیعری شاعیرەکان، لە تۆ داوای ئەوە دەکەم ئیدی بمکە بە ئیلهامی شیعر و ڕۆحی پێنووسەکەی شاعیرم پێ بجوڵێنە. خودا فەرمووی ئەی ئادەم داوا مەکە ببیتە حەوا.

پیاوەکە وتی ئەی خودا لە خەڵوەت و چوونە ناو باوەشی خەڵوەتگا بێزار بووم، من دەمەوێت بمکەیت بە خەڵوەتگاو خەڵوەتکێشەکان بێنە ناومەوە و بە بێداری زیکری تۆ بکەن. خودا فەرمووی ئەی پیاو ئێمە هەر لە ڕۆژی قالوبەلاوە ئەوەمان بڕاندووەتەوە کە تۆ خەڵوەت نشینیت و ئافرەتیش خەڵوەتگا، جا ئێوەی پیاوان هەر کاتێك بە ئاوی نوور خۆتان شۆری ئەوا بۆتان

هەیە بچنە ناو ئەو خەڵوەتگایەوە.

پیاوەکە وتی دەی باشە خودا ئەمجارەیان داوایەك دەکەم دڵم مەشکێنەو بفەرموو قبوڵ، لێت داوا دەکەم ئیدی نەجاتم بدە لەوەی پەروەردە بکرێم، بمکەرە پەروەردەکار. خودا فەرمووی ئەی باوك داوا مەکە ببیتە دایك.

دواینجار پیاوەکە وتی دەی باشە خودا، بەڵام شتێك هەیە حەز دەکەم پێتی بڵێم ئەویش ئەوەیە من پیاوێك دەناسم (هەرچەندە پیاو بوو، بەڵام فریشتەش بوو! هەرچەندە پیاو بوو، بەڵام گەورەترین ئیلهام بوو بۆ پێنووس بە دەستەکان! هەرچەندە پیاو بوو، بەڵام گەورەترین خەڵوەتگای ئەخلاق بوو بۆ گشت مرۆڤایەتی تەنانەت دایکان و ئافرەتانیش لە ناو باوەشی ئەخلاقی ئەودا خەڵوەتیان دەگرت و بە خەڵوەنشینی زیکر و یادی تۆیان دەکرد! هەرچەندە پیاو بوو، بەڵام تەنانەت ئافرەتانیشی پەروەردە دەکرد!) خودا فەرمووی مەگەر تۆ باسی ئەو پیاوە ناکەیت کە لە باوەشی حەلیمەی سەعدیەدا گەورە بوو؟ پیاوەکە بە شەرمەزارییەوە مەنزڵگای نزای جێهێشت".))

لە دوای خوێندنەوەی نامەکە جەستەم بە تەواوی گەرم داگیرابوو، نەمدەزانی ئەم نامەیە لە لایەن کێوە نووسراوە تەنانەت بە تەواویش لەوە دڵنیا نەبووم ئایا بۆ من نێردراوە یاخود بۆ کەسێکی دیکە، ئیتر ئەو شەوە هەرچەندە نیوەی کتێبێکیشم خوێندەوە، بەڵام هەموو خەیاڵم گرێدرابوو بەو نامەیەوە، بەیانی

کە مەخزەنەکەم جێهێشت نامەکەیشم لەگەڵ خۆم بردەوە بۆماڵەوە لە ماڵیشەوە دوو جاری تر خوێندمەوە.

ئێوارە کاتێك گەڕامەوە بۆ مەخزەنەکە وەکو شتێك زۆرم پەلە بوو دەموت با زوو بگەمە لێواری پەنجەرەی ژوورەکە بزانم هیچی تری لێ دانەنراوە کە گەیشتم بینیم زەرفێکی دیکەی نامە لە هەمان شوێن دانراوە! زۆر بەخێرایی بەر لە هەرئیشێك زەرفەکەم کردەوە و بینیم کاغەزێکی نووسراوی تێدایە منیش دەستمکرد بە خوێندنەوەی، لە کاغەزەکەدا نووسرابوو:

(("ئافرەت ئەو ئاوەیە ئەگەر نەیگەینێ لە تینوێتیدا دەخنکێین، بۆ ئەوەی ئادەم نەخنکێت خودا گەیاندییە سەر کانییەك بە ناوی حەوا، بەڵام ئافرەت ئاوێکی بۆندارە و بۆنی هەیە، بۆیە ئەگەر بێتوو بە نەزانی دەست ببەین بۆ شووشەی ئەو بۆنە ئەوا شووشەکە بەردەبێتەوە و دەشکێت ئەگەر شووشەکەیش شکا ئیدی بۆنەکە بڵاودەبێتەوە و مرۆڤایەتی مەست دەکات.

ئافرەت ئاوێکە زۆر لەوە ڕونتر و زوڵاڵتر و پێگەیەنەرترە کە هەموو درەختێك شایستەی ئەوەی هەبێت لێی بخواتەوە، درەختی وا هەیە بە خواردنەوەی تەنها دڵۆپێك لەم ئاوە گەڵاکانی سەرلەنوێ سەوز دەبنەوە و یەك پارچە دەبنە سێبەری موحیببەت، بەڵام درەختی واش هەیە نەك یەك دڵۆپ، بەڵکو ئەگەر چوار وەرزە لەم ئاوەی بدەیتێ هەر زڕە و هەر زڕە، بۆیە وەها درەختێك شایەنی ئەوەی نییە لەم ئاوە بخوات.

ئافرەت ئەو ئاوەیە ئەگەر ویستت شارستانییەتێك لە گەشەی ڕۆحی بوەستێنیت یاخود ئەگەر ویستت ڕۆحی هەر مرۆڤێك دەربکەیت لە جەستەیدا، یان ئەگەر ویستت هەر پێغەمبەرێك لە پێغەمبەربوون بخەیت ئەوا ئەم ئاوەی لێ بگرەوە و لەم ئاوە بێ بەشیکە، بەڵێ ئافرەت ئەو ئاوەیە نایەڵێت پێنووسەکەی من وشك ببێتەوە".))

ئیدی ئەم نامانە بە تەواوی سەرقاڵیان کردم، ئەو شەوەی نامەی دووەم، تەنانەت نەمتوانی لە سێ لاپەڕە زیاتر کتێب بخوێنمەوە، هەموو خەیاڵ و بیرم لای ئەوە بوو نووسەری ئەم نامانە کێیە؟ بۆچی لەم ژوورەدا دادەنرێت؟ مەبەست چییە لە باسکردنی ئافرەت لە نامەکاندا؟

ئەمشەو کۆتا شەوم بوو لە نۆرەکەی خۆم بۆ پاسەوانی مەخزەنەکە واتە سبەی شەو نۆرەی کاك حاجی بوو، بەڵام لەبەرئەوەی نەوەك سبەی شەو نامەی تر لێرە دابنرێت بۆیە بە کاك حاجیم وت سبەی شەویش تۆ مەیە من خۆم لە مەخزەن دەبم، بەڵام سبەی شەو کە هاتمەوە هیچ نامەیەك بوونی نەبوو، بە خۆمم دەوت لەوانەیە تەنها لەو شەوانەدا دابنرێت کە نۆرەی پاسەوانی خۆمە. بۆ بەیانییەکەی مەخزەنم جێهێشت و چوومەوە ماڵەوە، دواتر پێش عەسر لە ماڵ هاتمە دەرەوە بە نییەتی سەردانیکردنی

مامۆستا ئەکرەم، چوومە ماڵ مامۆستا ئەکرەم لە دوای سەلام و ئەحواڵ پرسینی یەکتر، نەختێك دانیشتین ماڵ مامۆستا زۆر بێدەنگ و کپ بوو، پرسیارم لە مامۆستا کرد:

_ ئەی دادە باخان لە کوێیە؟

+ شەهرام گیان دکتۆر ئاگاداری کردووە لەم چەند ڕۆژەدا منداڵی دەبێت، بۆیە ئەویش چووەتە ماڵ دایکی و ئەم چەند ڕۆژە لەوێ دەمێنێتەوە.

_ دەی خێری تیایە، سوپاس بۆ خودا کە دایکی دادە باخان لە نەخۆشیەکەی خۆیشی چاك بووەتەوە و دەتوانێت لەم کاتی منداڵبوونەی دادە باخاندا چاودێری دادە باخان و منداڵەکەتان بکات.

+ سوپاس بۆ خودا، بەڵام شەهرام گیان دوعای خێرمان بۆ بکە چونکە باخان زۆر ناساغ و ماندووە بە هۆی دووگیانییەکەیەوە.

پاش کەمێك دانیشتن مامۆستا کتێبێکی هەڵگرت، وتی:

+ شەهرام گیان ئەمە گۆڤارێکی ئەدەبییە دوێنێ ئەم ژمارەیەی بڵاوبوویەوە، بابەتەکانی ئەمجارەیان باسی عیشقە، پێشتر داوایان لە منیش کرد بابەتێکیان بۆ بنووسم ئەوەتا بابەتەکەیان دابەزاندووە. گۆڤارەکەم لە مامۆستا وەرگرت و دەستمکرد بە خوێندنەوەی بابەتەکەی مامۆستا لە نیوەی بابەتەکەدا مامۆستا

نووسیبووی وەکو شاعیر دەڵێت:

ئەی ویصاڵت، نووری ڕێگەی کەماڵی ڕۆح و ئیمانم
ئەی فیراقـت، مـن بـە جـاریْ کـافـرو مـاڵـە وێـرانم
ئەی ویصاڵت، ئـەحـیـای مـەمـاتـی ڕۆح و دڵ
ئەی فـیـراقـت، تـەشـریـفـی ڕۆحـم بـۆ ژێـر گڵ
ئەی ویصاڵت، لـوقـمـانـی نـەفـسـی ئەمـمارە
ئەی فیـراقـت، لـوقـمـان، خـۆیـشـی دەردەدارە
ئەی ویصاڵت، بـە مـەنـصـور عـەتـای "اناالحـق"
ئەی فـیـراقـت، مـەجـنـون و بـەردی ڕەق و تـەق

کە ئەم شیعرەم خوێندەوە لە خۆشیدا نەمدەزانی چی بکەم، بۆیە یەکسەر تەماشای پەراوێزی بابەتەکەی مامۆستام کرد بە مەبەستی بینینی ناوی شاعیری خاوەنی ئەم شیعرە کە مامۆستا نووسیبووی، بەڵام مامۆستا لە پەراوێزدا نووسیبووی "بەداخەوە من نازانم ئەم شیعرە هی چ شاعیرێکە، بەڵام چەند ڕۆژێك بەر لە ئێستا تیانووسێکی شیعریم بەدەست گەیشت لە لایەن ناسراوێکمەوە کە ئەویش تیانووسەکەی دۆزیبوویەوە، لە ناو ئەو تیانووسەدا ئەم شیعرە و چەندین شیعری دیکەی هاوشێوەی ئەمە تۆمارکراوە".

کە ئەم پەراوێزەم خوێندەوە یەکسەر وتم:

_ ماموٚستا گیان کوانێ، لە کوێیە دەفتەری شیعرەکەم؟

+ شەهرام گیان دەفتەری شیعری چی؟

_ ئەو دەفتەرەی کە دۆزیوتەتەوە.

+ شەهرام گیان من دەفتەرم نەدۆزیوەتەوە، تۆ کەمێك هێور بەرەوە و لەسەرخۆبە با لەیەك تێبگەین.

_ ماموٚستا گیان بەدەست خۆم نییە ناتوانم لەوە ئارامتر بم، مەبەستم ئەو دەفتەرەیە کە شیعرێکت لێ دەرکردووە و لە بابەتی ناو گۆڤارەکەدا نووسیوتە.

ماموٚستا هەستا دەفتەرەکەی لە ناو تاکی کتێبخانەکەدا دەرکرد و هێنای کردیەوە و وتی:

+ شەهرام گیان ئەم دەفتەرە دەلێیت؟

_ بەلێ ماموٚستا گیان، تۆ ئەم دەفتەرەت لە کوێ بوو؟

+ بۆچی شەهرام گیان ئەم دەفتەرە هی کێیە؟

_ ماموٚستا گیان ئەمە دەفتەرەکەی منە، نازانیت چەنێك بە دوایدا گەڕام.

+ شەهرام گیان من زیاتر مەبەستم شیعرەکانییەتی، ئەمانە شیعری کێن؟ خۆت دەزانیت من خوێنەرێکی ورد و بەردەوامی شیعر و ئەدەبیاتم، بەلاّم تائێستا شیعرەکانی ناو ئەم دەفتەرەم لەژێر ناوی هیچ شاعیرێکدا نەخوێندووەتەوە تەنها لەو دەفتەرەدا ئەم شیعرانەم بینیون.

_ ماموٚستا گیان ئەم شیعرانە هی خۆمن، بەلاّم تۆ پێم بلێ چۆن

ئەم دەفتەرەت دۆزییەوە؟ دواتر منیش داستانی نووسینی شیعرەکانت بۆ دەگێڕمەوە.

+ شەهرام گیان تۆ لە کوێ دەفتەرەکەت لێ ون بوو؟

_ مامۆستا گیان هەر لەو شوێنەی شیعرەکانم تیا نووسی.

+ کاکە شەهرام کەواتە ئەم شیعرانەت لەو کێوەی نزیک ئەشکەوتەکەی ئاوایی نووسیوە؟

_ مامۆستا گیان لە کێوەکە نا، بەڵکو ڕێك لە ناو ئەشکەوتەکەدا ئەم شیعرانەم نووسی، بەڵام چۆن ئەم دەفتەرە گەیشتە دەستی تۆ؟

+ شەهرام گیان چەند ڕۆژێك بەر لە نووسینی ئەو بابەتەی کە بۆ ئەم گۆڤارە ئەدەبییەم نووسیوە بە سەردانێکی دوو شەوی لەگەڵ باخان چووین بۆ لادێکە، شەوی دووەم لە ماڵ کاك دانا باینەوە جا دوای ئەوەی لە نوێژی خەوتنان لە مزگەوتەوە گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە کەمێك دانیشتین پاشان کاك دانا وتی مامۆستا گیان ماوەیەك بەر لە ئێستا حەمەشوانی برام لەو شاخە کاتێك خەریکی شوانی بووە ڕۆژێکیان دەفتەرێکی دۆزیبوویەوە و هێنایەوە بۆ ماڵەوە منیش لەو ڕۆژەوە هەڵمگرتووە و نیازم وابوو ئەگەر تۆ ببینم نیشانتی بدەم، بۆیە با بڕۆم لە ژوورەکەی ئەودیو بیهێنم تۆش تەماشای بکە بزانە چییە، کاتێك دەفتەرەکەی هێناو لیی ورد بوومەوە بینم ئەم شیعرانەی تێدا نووسراوە ئیتر لەسەر ئیزنی کاك دانا لێم وەرگرت و بەمشێوەیە لای خۆم گلم داوەتەوە.

_ ئای خوایە شوکرت، هەمیشە سوپاس، من مەمنونی تۆ و

کاك دانا و لە ئێوەش زیاتر مەمنونی کاکە حەمەشوانم.

+ ئەی داستانی نووسینی شیعرەکان چی بوو شەهرام گیان؟

_ مامۆستا سێ ساڵ پێش ئێستا شەوێکیان لە کاتی نوێژی بەیانیدا کە چوومە سوجدە بەدەر لە خوێندنی زیکرەکانی ناو سوجدە بەبێ ویستی خۆم کۆمەڵێك زیکر و ویردی زۆر جیاواز و تایبەت بە زارمدا دەهاتن! هەرچەند دەمویست نەیانڵێم و لە سوجدە هەستمەوە، بەڵام نە دەمتوانی بێدەنگ بم و نە دەشمتوانی لە سوجدەکە هەستمەوە، ئیدی پاش ئەم نوێژە درێژخایەنە گۆڕانێکی ڕۆحی و ناوەکی سەیر بەسەر مندا هات، بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك لە دەوروبەرم بێئاگا بووم، تا ئەوەی خۆم پێنەگیرا و بەناوی سەردانکردنی برادەرێکم لە ماڵەوە هاتمە دەرەوە و، خۆیشم نەمزانی و بیرم نایەت چۆن گەیشتمە ئەو ئەشکەوتە، لە کونجێکی ئەشکەوتەکە ئەم دەفتەرە و پێنووسێك دانرابوون ئیتر بەشی سەرەتای ئەم شیعرانەی ناو ئەم دەفتەرە ئەو کاتە تۆمار کران، خۆیشم باوەڕ ناکەم خۆم نووسیبێتمن، کە گەڕامەوە بۆ ماڵەوە دەفتەرەکەم لەگەڵ خۆم بردەوە، ئیدی بۆ ماوەی دوو ساڵ یان دوو ساڵ و شتێکیش زیاتر چەند جارێك سەردانی ئەو ئەشکەوتەم کرد و لەو سەردانانەدا ئەم شیعرانە تۆمار کران، بەڵام لەم چەند مانگەی دوایدا هەستم دەکرد ئەو گۆڕانە ڕۆحیەی پێشتر بەسەرمدا هات بە ئەندازەی خۆی بە قەدر و قیمەتەوە بۆی ناڕوانم وە بە ڕێژەیەکی زۆریش خۆم بە هۆکار و خولقێنەری ئەو گۆڕانە

دەزانی واتە جۆرێك لە كیبر بەرۆكی ڕۆحی گرتبووم، بۆیە دوواینجار كە هاتمە ئەشكەوتەكە دەفتەرەكەم لێ ون بوویو دیار نەما، بەدەر لە ونبوونی دەفتەرەكەش كاریگەری گۆڕانە ڕۆحیەكەشم بە تەواوی لەسەر لاچوو، ئیدی لەو كاتەوە تا ئەم دواییە كە لەگەڵ تۆدا ئاشنایەتیم پەیدا كرد بە تەواوی لە چێژ و لەززەتی ڕۆحی ئەم ژیانە دابڕا بووم، بەڵام ئەمە بە ئاگاداركردنەوەیەكی خوایی دەزانم، خوای گەورە وا بۆ جارێكی تر لوتف و بەخشندەیی خۆی لەگەڵ نواندم و دەفتەرەكەی پێبەخشیمەوە، بەڵكو ئەم پێبەخشینەوەی دەفتەرە ئامادەكارییەك بێت بۆ ئەوەی جارێكی دیكە گۆڕانە ڕۆحیەكەیشم بەسەردا بێتەوە.

+ كەواتە شەهرام گیان شاعیریشی، بەڵام لای ئێمە وا خۆت نیشان نەداوە.

_ باوەڕ بكە مامۆستا ئەكرەم هەرگیز ناتوانم بە خۆم بڵێم شاعیر، چونكە لە دوای دابڕانم لەو گۆڕانە ڕۆحیەی باسمكرد ئیدی نەمتوانیوە تەنانەت یەك دێڕیش بنووسم، بۆیە هەرچی هەبوو هەمووی هی ئەو ماوەیە بوو كە ئەو گۆڕانە ڕۆحیە ڕوویدا.

+ دەی شاعیربوونیش هەر ئەوەیە كە تۆ دەیڵێیت "گۆڕانی ڕۆحی و ناوەكی" واتە شاعیربوون بریتی نییە لە كردنی قسەی زل زل، بریتی نییە لە كۆتایی پێهێنانی دوو دێڕ یاخود دوو نیوە دێڕ بە هەمان پیت و هەمان وشە، یەكەم هەنگاوی سەفەری

شاعیربوونی هەرکەسێك ئەگەر لە ڕۆحی ئەو کەسەوە دەست پێ نەکات ئیدی ئەوەی دەینووسێت شیعر نییە، چونکە شیعر وەك مۆسیقا و عیبادەت ناوەکیترین و ڕۆحیترین بەرهەمی مرۆڤە.

شاعیر ئەو کەسەیە بەرلەوەی پێنووسەکەی بگرێت بە دەستییەوە دڵنیایە لەوەی کە مانایەکی لایە هەموان دەرەقەتی حاڵیبوونی نایەن، بۆیە من زۆر زۆر بەلامەوە سەیرە بەو دێڕەی هەموو کەس لێی تێدەگات پێی دەڵێن شیعر و بە شیعر لە قەڵەمی دەدەن، چونکە شیعریش وەکو تەوەرێکی مەزنی ناو کایەی ئەدەب " زۆرجار هەموو ئەدەبییش دەگەڕێتەوە بۆ شیعر یاخود ئەگەر کایەی ئەدەب شیعری لێ بکەیتە دەرەوە هەتیو دەکەوێت" کارەکەی بریتییە لە دەستکاریکردنی واقیع، یاخود کاری شیعر بریتییە لە نیشاندانی ئەو وێنەیەی لە واقیعدا بوونی نییە یان دەتوانین بڵێین شیعر ئەگەر وێنەیەکی ناو واقعیش نیشان بدات هەرگیز بەو شێوە سادە و ڕووکەشە نیشانی نادات کە خۆی بوونی هەیە، ئەگەر ئەمە کاری شیعر بێت ئیتر چۆن چاوێك توانای تێگەیشتنی لە شیعر هەیە کە ناتوانێت وێنەکان بە جۆرێکی دیکە ببینێت، جا لێرەوەیە ئەهلی شیعر و مانا بە ئەزموون بەوە گەیشتوون کە بۆ ئەوەی مرۆڤێك ببێتە ئەهلی شیعر ببێتە ئەهلی مانا نابێت چاوەڕوانی ئەوە بکات وێنە شیعریەکانی شاعیر بگۆڕێن و سادە ببنەوە تاکو ئەم لێیان تێبگات و لە واتاکەی حاڵی ببێت، نەخێر بەمجۆرە نییە، بەڵکو دەبێت ئەم کەسە دەست بکات

بە گۆڕانكاری لە بینینەكانی خۆیدا، دەبێت دید و بینینەكانی خۆی پاك بكاتەوە، بۆئەوەی چی وێنە هەیە ببیبنێت، ئەم گۆڕانكاری و پاككردنەوەیە بە تەواوی بابەتێكی ڕۆحییە، واتە چەند وێنەیەكی بچوك ڕۆحی مرۆڤیان داگیر كردووە، بەڵام ئەهلی شیعر و ئەهلی مانا ئەو كەسەیە كە ئەم وێنە بچوكانە لە ڕۆحی خۆی فڕێ دەداتە دەرەوە و بە نووری وێنە مەزنەكە ڕۆحی خۆی پڕ لە نوور دەكات، نووریش لە ڕووناكی زیاتر تاریكی ڕۆشن دەكاتەوە بۆیە ئەوەیش كە خودا باسی لێوە دەكات نوورە نەك ڕووناكی، جا بەشێك لە شیعرەكان بە تایبەت شیعرە كلاسیكیەكان پێویستیان بەم نوورە هەیە بۆئەوەی وێنەكانیان ببینین و لە ماناكانیان حاڵی ببین، ئەگەرنا بەشێكی دیكە لە شیعرەكان بۆ لێحاڵیبوونیان نەك نوور پێویستمان بە ڕووناكیش نییە چونكە خۆیان لە تاریكیدا نووسراون یاخود جوانترە بڵێین بۆ كوێرەكان نووسراون.

هەروەها ئەگەر هاتوو ئەم گۆڕانكارییە ڕۆحیەمان فەرامۆش كرد و تەمای ئەوەمان هەبوو وێنە شیعریەكانی شاعیر گۆڕانیان بەسەردا بێت ئەوا ئەمجارەیان نەك نزیك، بەڵكو زیاتر لە مانا دوور دەكەوینەوە، چونكە وێنە شیعریەكانی شاعیر ئەگەر گۆڕانیشیان بەسەردا بێت ئەوا قوڵتر دەبنەوە. دەبێت ئەوەش لە یاد نەكەین لای شاعیر حەقیقەت ئەو درەختەیە بە ئاوێك ئاو دەدرێت كە ئەو ئاوە بریتیە لە "جوانی" تەنانەت شاعیر ئامادەیە لە پێناوی

جوانیدا لە حەقیقەت لابدات، ئەوەیش کە وتمان "شیعر دەستکاری واقیع دەکات و زۆرجار دژی واقیعیش دێتەوە" ئەمە لە پێناوی حەقیقەتدا نییە، بەڵکو لە پێناوی جوانیدایە، بۆیە بەو دەقە دەتوانین بڵێین شیعر کە لە جوانی خاڵی نییە، هەر ئەم خاڵەشە وایکردووە ئەگەر لە بری مێژوونووسەکان شاعیرەکان مێژوو بگێڕنەوە جا با ئەو مێژووە باسی "لە داردانی مەنصوری حەللاج" بێت یاخود باسی "خۆشارینەوەی پێغەمبەر و ئەبوبەکری صدیق لە نێوان دوو بەرددا" بێت هەر جوان و پڕ چێژە چونکە شاعیر وێنەکەی کێشاوە، جا شیعر بەهۆی ئەم جوانییەوەیەتی مرۆڤ ناسك دەکاتەوە، بۆیە ئەگەر شیعرێك بە زۆرینەی پێوەرەکان جوان بێت، بەڵام نووسەرەکەی زبر بێت من ناتوانم بە شیعر ناوی ببەم.

پێشتر وتم یەکەم هەنگاوی سەفەری شاعیر دەبێت لە ڕۆحی خۆیەوە بێت هەر بۆیە پێوەری شاعیربوون ئەو بەیتانە نین لە کتێبێکدا بە ناوی دیوانەوە تۆمار دەکرێن، بەڵکو ڕۆحی شاعیر مۆر و سەنەدە بۆ شاعیربوون یاخود شاعیرنەبوون، دەزانیت چ ڕۆحێکی مەزن و شاعیرانەی هەیە ئەو کەسەی پەشیمانە لە کوشتنی چۆلەکەکانی سەردەمی منداڵی، یاخود ئەو کەسەی بە هەموو وجودی هاواری پەشیمانی دەکات لەوەی بە منداڵی دەستی دەگەیاندە هێلانەی باڵندەکان و دەیشێواندن! بۆیە بۆ ناسکبوونەوە و گەورەبوونی ڕۆح ئەو سیحرەی لە جوانی شیعردا

هەیە کەمتر نییە لە سیحری ناو مۆسیقا و عیبادەت "ئەسڵەن دەگونجێت مۆسیقا و عیبادەت شیعریان تێدا نەبێت، بەڵام هەرگیز شیعر خاڵی نییە لە مۆسیقا و عیبادەت" تەنانەت جاری وا هەیە دەبینیت کەسێك چەند ساڵە خەریکی خوێندنەوەی قورئانە کەچی ئەوەندەی ئەو کەسە ناسك نییە کە دیوانی شاعیرە مەزنەکان دەخوێنێتەوە "هەڵبەت هۆکاری ئەمە تێنەگەیشتنە لە قورئان و عیبادەت" بەدەر لەمە، ئەگەر هەموو مێژوو تەی بکەیت ڕۆحانییەکی مەزن نادۆزیتەوە لە شیعر دوور بێت تەنانەت ئەوەی کە پێغەمبەر (د.خ) بۆ خوێندنی بانگ بیلال دەستنیشان دەکات ئەمە بەشێکی لەبەر دەنگە خۆشەکەی بیلالە کە ئەمە پەیوەندی ڕۆحی پێغەمبەرمان پێ دەڵێت لەگەڵ مۆسیقادا، یاخود عیبادەتی نیوەشەو و پرسیارکردنی حاڵی تەیرەکە لە منداڵەکە و چەنەها شتی دیکە ئەمانە هەموویان دەرخەری نزیکی ڕۆحی پێغەمبەرن لە جوانی و شیعر.

_ مامۆستا تۆ ئەمشەو بەتەمای چیت؟ هیچ ئیشێکی گرنگت هەیە؟

+ بۆچی شەهرام گیان؟

_ ڕاستییەکەی ئەگەر ئیشت نییە منیش ئەمشەو نۆرەی پاسەوانی کردنی مەخزەنەکەم نییە، بۆیە حەز دەکەم لێرە پێکەوە بمێنینەوە و هەندێك باسی شیعرم بۆ بکەیت.

+ شەهرام گیان دوای عەسر مەوعیدێکم هەیە لەگەڵ

برادەرێکمدا، ئەگەر حەز دەکەیت ئەوا پێکەوە دەچین بۆ لای ئەو برادەرم، هەر کە ئیشەکەمان تەواو بوو دەگەڕێینەوە و شەو بۆ خۆمان لێرە دەبین.

_ زۆر باشە مامۆستا گیان، بەڵام تا تۆ دەچیت بۆ لای ئەو برادەرت و دەگەڕێیتەوە منیش سەرێك دەدەم لە ناوبازاڕ و چەند کتێبێکم پێویستە ئەگەر دەستمکەوێت دەیکڕم، منیش دواتر دەگەڕێمەوە بۆ ئێرە.

ئەوەبوو چەند خولەکێك پێش بانگی ئێوارە گەڕامەوە و ڕاستەوخۆ چووم بۆ مزگەوتەکەی نزیك ماڵی مامۆستا بۆ کردنی نوێژی ئێوارە کە چوومە ناو مزگەوتەکە بینیم مامۆستا ئەکرەمیش خەریکی دەستنوێژهەڵگرتنە، سەلاممان لە یەکتری کرد و بەخێرهاتنەوەی یەکترمان کرد، دوای نوێژ گەڕاینەوە بۆ ماڵی مامۆستا ئەکرەم من کیلۆیەك ترێ ڕەشەم کڕیبوو بەو نییەتەی ئێوارە بیخۆین، مامۆستاش وتی شەهرام گیان نازانم تۆ حەزت لێیەتی یان نا، بەڵام پێش ئەوەی بێم بۆ مزگەوت خورما و ڕۆنێکم ئامادە کرد بۆئەوەی بیخۆین، ئیتر ئەوەبوو هەردووکمان بە حەزێکی زۆرەوە دانیشتین خورما و ڕۆنەکەمان خوارد و دواتریش چامان خواردەوە و پاش کەمێکی دیکە چووین لە مزگەوت نوێژی خەوتنانمان کرد و گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە، ئیتر دانیشتین، من چەند شیعرێکی ناو دەفتەرەکەم خوێندەوە، مامۆستاش پاش کەمێك وتی:

+ شەهرام گیان بۆ باسی شیعر لە کوێوە دەست پێ بکەین؟

_ مامۆستا شیعر بە واتا ڕاستەقینەکەی بریتیە لە چی؟ یاخود کام دەقە شایەنی ئەوەی هەیە پێی بوترێت شیعر؟

+ کاکە شەهرام، هاتنە دنیای منداڵێك ئەو کاتە ڕوو دەدات دایك و باوکێك بوونیان هەبێت، بەڵام ئەمەش بەو مانایە نییە وابزانین هەبوونی دایك و باوك واتە هاتنە دنیای منداڵێك، چونکە زۆرجار دایك و باوکیش بوونیان هەیە، بەڵام نابینین منداڵێك لەدایك ببێت وە هەندێکجار بەبێ بوونی باوکێکیش منداڵ دێتە دنیاوە واتە "جاری وا هەبووە باوکیش بوونی نەبووە، بەڵام منداڵ لەدایکبووە" کە ئەمەیان ئاسایی نییەو موعجیزەیە وەك "لەدایکبوونی حەزرەتی عیسا" بەڵام لە هەر حاڵێکدا بۆ لەدایکبوونی منداڵێك دەبێت دایکێك بوونی هەبێت، جا ئەم بابەتە لە ئەدەبیشدا بوونی هەیە بە تایبەت لە شیعردا، واتە بۆ لەدایکبوونی دەقێکی شیعری دەبێت دایك و باوکێك بوونیان هەبێت کە دایك و باوك لە شیعردا بریتیە لە "ناوەڕۆك" و "ڕوخسار" ناوەڕۆك دایکە و ڕوخساریش باوك، دەبێت ناوەڕۆك و ڕوخسار کرداری جووتبوون ئەنجام بدەن بۆئەوەی شیعرێك لەدایك ببێت، خۆ ئەگەر بەبێ هەبوونی باوکە ڕوخسار بەرهەمێکی ئەدەبی یاخود دەقێکی شیعری لەدایکبوو ئەمە بە تەنها بریتی نییە لە لەدایکبوونی بەرهەمێکی ئەدەبی یاخود دەقێکی شیعری و بەس، بەڵکو ئەمە موعجیزەیەکیشە ڕوویداوە. لە لایەکی دیکەوە شیعر

بریتی نییە لە نووسینی وشەی ئاڵۆز و شتی نامۆ، بەڵکو بە پێچەوانەوە شیعر لە ڕێگەی هەمان وشە سادەکانەوە وێنەی گەورە و نامۆ خەلق دەکات.

هەروەها ئەگەر ئەوەمان قبوڵ بێت کە پێناسەی شیعر بریتیە لەو ئاخاوتنەی کە کێش و سەروای هەیە ئەوا قبوڵی ئەوەمان کردووە هەرشتێك کێش و سەروای هەبوو ئیدی ئەوە شیعرە! کە ئەمە شتێکی زۆر ناعەقلانی و نالۆژیکیە، هەڵبەتە ڕاستە کە شیعری چێژبەخش و جوان نابێت کەموکورتی هەبێت لە ڕووی کێش و سەرواوە، بەڵام ئەمە ناکاتە ئەوەی هەرشتێك کێش و سەروای نەبوو ئیدی ئەوە شیعر نییە. هەروەها مەرج نییە شیعر پەیرەوی ڕێزمان بکات، چونکە شاعیر بۆ نووسینی دەقێك چەند وشەیەك بەکاردێنێت، بۆنمونە وشەکانی "بەرد، دار، یار، شێت، ...هتد" بەڵام شاعیر لە بەکارهێنانی وشەکاندا ئەرك و سیفەتی وشەکان دەگۆڕێت کە ئەم گۆڕینە زیاتر لادانە لە ناوەڕۆکدا، جا زۆر وەخت شاعیر بۆ گەیاندنی ئەو لادانەی کە لە ناوەڕۆکدا ئەنجامیداوە پێویستی بە لادانە لە ڕوخساریشدا کە ئەمەش ئاساییە چونکە ئەرکی شاعیر بریتی نییە لە پاراستنی ڕێسا ڕێزمانییەکان.

_ مامۆستا ئەگەر شیعر ئەمە بێت کە باست کرد، کەواتە شیعر چی بۆ مرۆڤ دەکات؟ یان شیعر چی بە مرۆڤ دەبەخشێت؟

+ شەهرام گیان، ئەوەی شیعر بۆ مرۆڤی دەکات مەگەر مۆسیقا

و عیبادەت بتوانن بۆ مرڤی ئەنجام بدەن، شیعر مەزنترین توانای هەیە لە نیشاندانی ئەو شتانەدا کە نابینرێن، زەوی لەو جێیەدا بە قیمەتتر و قەدراویترە کە شیعری لێیە چونکە لە هەرشوێنێکی ئەم زەویەدا شیعر بوونی هەبێت ئیتر لەو شوێنە زەوی بە ئاسمان بارگاوی دەبێت، ئەمە هەر بۆ شوێن بەمجۆرە نییە، بەڵکو لە ڕوی زەمەنیشەوە هەر وایە بۆیە ئەو زەمەن و سەردەمەی شیعر کەمتر بووە "کە مەبەستم لە چۆنێتی شیعرە نەك چەندێتی" ئەوا جوانی کەمتر بووە یاخود ئەگەر ڕاستتر بڵێین لە زەمەنی کەمی شیعردا مرۆڤەکانیش کەمتر چاویان بۆ ئاسمان هەڵبڕیوە. شیعر نایابترین کار بۆ مرۆڤ دەکات ئەویش بە فریشتەکردنی مرۆڤە لە قاڵبی مرۆڤدا، بۆیە ئەگەر سەرزەوی شیعری لێ ببڕێت ئیتر ترسناکترین ڕووداو ئەگەری ڕوودانی زۆر مومکین و ئاساییە واتە "دووری و خاڵیبوون لە شیعر گەورەترین هۆکاری ڕوودانی جەنگە سیاسیەکانیشە" جا لێرەوەیە کە سەیرترین شت ئەوەیە سیاسییەك شاعیر بێت.

بەدەر لەوەیش کە لە سەرەوە ئاماژەمان بۆ کرد، ئەگەر بە قووڵی لە سەدە زێڕین و پرشنگدارەکانی ڕۆژهەڵاتیش بڕوانین دەبینین بە ئەندازەی بوونی شاعیرە ڕاستەقینەکان ڕۆژهەڵات جوانی و ڕەسەنایەتی و سەربەرزی بۆ خۆی تۆمار کردووە، تەنانەت لە ناو گشت نەتەوە موسوڵمانەکانیشدا لە ڕووی دینییەوە ئەو سەدەیە دینیتر و ڕۆحانیتر و جوانتر و قبوڵکراوتر

بووە کە پێشڕەوە دینییەکان لە شیعرەوە نزیك بوون یاخود هەندێك لە پێشڕەوە دینییەکانمان بەهۆی ڕۆحانی بوونیانەوە شاعیرترین مرۆڤیش بوون، بۆیە ئەوەی شیعر دەیبەخشێت بە مرۆڤ و مرۆڤایەتی هەروا شتێکی سادە و کەم قیمەت نییە، جا هەر لەم ڕوانگەیەوەیە کە نابێت بە کەمتر لە دەستکەوتە سیاسیەکانمان بڕوانین بۆ دەستکەوتە شیعری و ئەدەبیەکانمان تەنانەت مێژوو پێمان دەڵێت زۆرینەی جارەکان ئەدەب یاخود هونەر گەورەترین ئاشنایەتی و نزیکبوونەوەی لە نێوان دوو میللەتدا خولقاندووە کە ئەمە یەکێکە لە دەستکەوتە گەورەکان، بەڵام دواتر سیاسەت و سیاسیەکان بوونەتە مایەی کوشتن و مراندنی ئەم ئاشنایەتی و نزیك بوونەوەیە. تەنانەت زۆرجار سیاسیەکان ئەوەندە گلاو دەبن تا ئەو ڕادەیەی دەستکەوتەکەیان بریتیە لە کوشتنی شاعیرێك کە ئەمە قێزەونترین و بوغزاویترین حاڵیبوونە لە سیاسەت.

_ مامۆستا ئەو کاتەی لە ئەشکەوتەکە ئەم شیعرانەم دەنووسی چێژێکی زۆر سەیرم لەو نووسینە دەبرد کە ئەوەندەی ژیانی خۆمم لەبیر بێت هەرگیز چێژی وام لە هیچ کارێکی دیکە نەبردووە، وە هەستم دەکرد نووسینی ئەم شیعرانەشم بریتیە لە گواستنەوەی ئەو چێژە بۆ خوێنەری شیعرەکان.

+ شەهرام گیان، ناتوانین لەوە ئینکاری بکەین کە چێژ لایەنێکی دانەبڕاوە لە شیعر ، هەم لە نووسینی شیعر هەم لە خوێندنەوەی واتە هەم شاعیر چێژ لە نووسینی شیعر دەبات وە

هەم خوێنەریش چێژ لە خوێندنەوەی شیعر دەبات تەنانەت ئەگەر تەنها لە ڕووی چێژەوە لە شیعر بڕوانین ئەوا من وای دەبینم کە "جیهانی شیعر بەدیلی ئەگەری نەبوونی بەهەشتە"، بەڵام خۆ ئەگەر وابزانین تەواوی مەبەستی نووسینی شیعر بریتیە لە چێژ و بەس ئەوە بەهەڵە لە مەبەستی نووسینی شیعر حاڵی بووین، چونکە چەندین شاعیرمان هەیە بە تایبەت کلاسیکیەکان لە ناو دەقە شیعریەکانیاندا دەردەکەوێت کە ئەگەر شاعیر نەبوونایە ئەوا بێگومان بیریارێك یاخود فەیلەسوفێك دەبوون، بەڵام زاڵبوونی چێژی شیعر و زمانی ئەدەبی لە نووسینیاندا وایکردووە شاعیر بن. هەروەك چۆن کۆمەڵێك بیریار و فەیلەسوفمان هەیە بەهۆی زاڵبوونی زمانی فیکرەوە لە نووسینیاندا بوونەتە فەیلەسوف و نەبوونەتە شاعیر، بەکورتی شیعر بە تەنیا بریتی نییە لە چێژ، بەڵکو شیعر پەیامی فیکری و فەلسەفیشی لە خۆیدا هەڵگرتووە، هەر بۆیە زۆرن ئەو شیعرانەی کە بە تەنیا لێکۆڵەرە ئەدەبیەکان دەرەقەتیان نایەن لە لێکۆڵینەوەدا، بەڵکو بۆ لێکۆڵینەوەیان پێویستمان بە لێکۆڵەرێکی فەلسەفیش هەیە، بۆیە شاعیر دەبێت لەوە عاقڵتر بێت کە تەواوی مەبەستی لە نووسینی شیعردا بریتی بێت لە چێژ.

لە لایەکی دیکەوە دەتوانین ئەوەش بڵێین پەیوەندی نێوان "شیعرو فەلسەفە" یان "ئەدەب و فیکر" یاخود "شیعرو مەعریفە" لەوێوە دەست پێدەکات کە هیچ شاعیرێکی دنیا نییە ئەهلی مەعریفە و فیکر و فەلسەفە نەبێت، بۆیە هەر ئەوەی کە شاعیرێك

ئەهلی ئەم کایانە "فیکرو مەعریفە" نەبێت باشترین دەلیلێکە بۆئەوەی ئێمە نازناوی شاعیری لێ بسێنینەوە، بەڵام بەدواداچوونی ئەم کایانەش بە تەنیا نابێتە دەلیل بۆ شاعیربوون. تا چەند سەرچاوە مەعریفی و فیکریەکانی شاعیر قوڵترو پڕتر بن ئەوا شیعریشی ئەوەندە ڕەمز ئامێز دەبێت، کە هەرگیز ناکرێت و نەگونجاوە شیعر لە ڕەمز خاڵی بێت. پەیوەندی نێوان شیعر و مەعریفەی شاعیر پەیوەندییەکی تەواو ڕاستەوانەیە وە بە تەنیا بەهرەی شاعیر بەس نییە بۆئەوەی شیعر بوونی هەبێت هەرچەندە چەندین شیعر هەیە بە تەنیا لە دایکبووی بەهرەن، بەڵام ئەم جۆرە شیعرە جگە لە سەرابێك هیچی تر نییە، ئەو شیعرانەیش کە جاویدان و هەمیشە زیندوون خاوەنەکانیان بە تەنیشت شاعیربوونەکەیانەوە یەکێکیشە لە دیارترین ڕۆشنبیر و مەعریفەخوازی سەردەمەکەی خۆی، بەڵام ئەوەی مەعریفەی شاعیرێك لە مەعریفەی بیریار و فەیلەسوفێك جیا دەکاتەوە بریتیە لە مامەڵەیان لەگەڵ مەعریفەکەدا، شاعیر چ لە وەرگرتنی مەعریفەدا و چ لە ئیزافەکردنی مەعریفەدا کار لەسەر "جوانی" دەکات، بەڵام بیریارێك لە هەردوو حاڵەتەکەدا "وەرگرتن و ئیزافەکردن" کاری بە حەقیقەتی مەعریفە هەیە نەك شتی تر، ئیشکردنی شاعیریش لەسەر جوانی لەبەرئەوەیە کە دەکرێت هەموو شتەکانی دیکە جگە لە جوانی لە شیعر بسەنینەوەو کەچی ئەو نووسراوە هەر بە شیعر ناوی بمێنێتەوە، بەڵام مومکین نییە جوانی لە شیعر بسەنینەوەو بە شیعریش بمێنێتەوە، تەنانەت

تەواوی چێژی شیعریش وەستاوە لەسەر بوونی جوانی لە شیعردا.

کاکە شەهرام شتێك کە زۆر بەلای منەوە سەیرەو جێی سەرسوڕمانە ئەوەیە زۆرێك هەن شیعر و فیکر یاخود ئەدەب و فەلسەفە بە دژی یەك لە قەڵەم دەدەن، بەلام لە ڕاستیدا ئەم دوو کایە "شیعر و فیکر" نەك دژی یەك ناوەستنەوە، بەڵکو زۆر جار ئەدەب بە گشتی و لە ناو ئەدەبیشدا شیعر بە تایبەتی ئەو حەقیقەتەیە کە فیکر و فەلسەفە عەودالّیەتی هەروەك چۆن لە ناو فەلسەفەدا بە تایبەت ئەو فەلسەفانەی کە کایەیەکی ڕۆحین و ڕەهەندێکی ڕۆحییان هەیە حەقیقەتێکی ئەوەندە جوان بوونی هەیە کە بریتیە لە هەمان ئەو جوانییەی لە شیعردا بوونی هەیە، بۆیە ناتوانین بە شێوەیەکی کوللی و ڕەها شیعر لە بەرەیەك حساب بکەین و فیکریش لە بەرەیەکی دی وە ئەم دوو بەرەیەش بە دژی یەك لە قەڵەمیان بدەین، بەلام دەتوانین بڵێین لەو جێیەدا کە حەقیقەتەکانی ناو کایە فەلسەفیەکان جوانن وە لەو جێیەشدا کە جوانییەکانی شیعر بریتین لە حەقیقەتێکی مەزن ئەوا شیعر و فیکر "ئەدەب و فەلسەفە" بە تەواوی لێك ئالاون. تەنانەت شاعیر دەبێت فیکر و خەیالّی ئەوەندە مەزن بێت ترسی ئەوەی بۆ دروست ببێت بتوانێت ئەم خەیاڵە مەزنە بە شیعر تۆمار بکات، بەلام لە هەمان کاتدا دەبێت ئەوەندەیش شاعیر بێت بتوانێت گەورەترین خەیالّ و قوڵترین فیکر و مەعریفە بە شیعر تۆمار بکات، بۆیە هەر مەعریفەیەك تا ئەو ساتەی لە دەرەوەی شیعرە

ئاساییە ئەگەر تەنها خوێندنەوەیەکی عەقڵی و لۆژیکی بۆ بکرێت، بەڵام هەر ساتێك ئەو مەعریفەیە کەوتە ناو شیعرەوە و لە ڕێی شیعرەوە ئیزافەکرا ئیدی تەنها ئامادەبوونی عەقڵی بەس نییە بۆئەوەی بتوانین حەقیقەتی ئەو مەعریفەیە کەشف بکەین، با خوێندنەوە لە بنەڕەتدا کارێکی تەواو عەقڵانیش بێت.

هەروەها ئەو ڕوکار و ڕوخسارە ئاڵۆزەی لە شیعردا هەیە یەکێکی ترە لە دەلیلەکانی نزیکی شیعر و فیکر لە یەکتر، ئەگەر بە وردی سەرنج بدەینە بەرهەمی نووسراوی بەشێك لەو نووسەرانەی لە ناو کایە ئەدەبیەکانی وەك "شیعر، ڕۆمان، چیرۆك، ... هتد" دەنووسن، ئەوا ئەوەمان بەرچاو دەکەوێت کە تەنیا لەبەر "جوانی" ئەم کایانەیان هەڵبژاردووە بۆ گەیاندنی پەیامەکانی خۆیان ئەگەرنا پەیامەکانیان غەیری فیکر و فەلسەفە و حیکمەت شتێکی دیکە نییە. تەنانەت لە ناو دەقەکانی قورئان و هەموو دەقە ئاسمانییەکانی دیکەشدا لەگەڵ ئەو گشت لایەنە فیکری و فەلسەفی و زانستیانەی کە تیایاندا بوونی هەیە ناتوانین لایەنێکی دیکە و ڕەهەندێکی دیکە فەرامۆش بکەین کە ئەویش لایەنە ئەدەبی و شیعری و ڕەوانبێژیەکەیەتی، وە لە ناو دەقە ئاسمانییەکاندا دوو لایەن بوونی هەیە کە دەکرێت سەرچاوەیەکی مەزن و پڕ کەڵك بن بۆ داڕشتنی هەر دەقێکی دیکە ئەوانیش، یەکەم "بەیەکەوە هێنان و لێك ئاڵاندنی قووڵی و جوانی"، دووەم "لایەنی ڕەوانبێژی" ئەمەش جارێکی تر دەرخەری نزیکایەتی و پەیوەندییە لە نێوان شیعرو فیکردا.

ئێمە دەتوانین لە ڕێگەی فیکرەوە بگەین بە حەقیقەت وە لە ڕێگەی شیعریشەوە بگەین بە جوانی، هەروەها بە گرتنەبەری ڕێگەی فیکرو شیعر پێکەوە دەگەین بە حەقیقەتێکی جوان، هەروەك چۆن لە دیندا بۆ گەیشتن بە حەقیقەت پێویستمان بە گرتنەبەری ڕێگەی شەریعەت و تەریقەتە پێکەوە کە ئەزموونی عارفەکان و پیاوە ڕۆحانییەکان ئەمەمان پێ دەڵێت.

_ مامۆستا زۆر باس لە چەمکی "جوانی" دەکەیت و بە بنەمایەکی گەورەی شیعر وەسفی دەکەیت، بەڵام مانای ئەم چەمکە لای من زۆر ڕوون نییە.

+ شەهرام گیان جوانی زیاتر پەیوەندی بە بینینەوە هەیە تا وتن، بەڵام بۆئەوەی لە یەك تێبگەین زیاتری لەسەر دەڵێین و ڕوونتری دەکەینەوە، هەرچەندە جوانی لە خزمەتی ڕۆحدایە، بەڵام ئەو خزمەتەی جوانی دەیکات ئەوەندە مەزنە تەنانەت زۆرجار بۆ گەیشتن بە جوانی ڕۆح خۆیشی دەکەین بەقوربانی، ئەم خۆقووربانیکردنەی ڕۆحیش گەورەترین دەلیلە بۆ بایەخی جوانی، بەڵام دەبێت ئەوەمان لەیاد بێت ئەگەر هەموو جوانییە فانی و لەناوچووەکان پێکەوە جەم کەیت ناگەن بە پریشکێکی جوانییە ناوەکی و ڕۆحیەکان، کە جوانی ناو شیعر زیاتر شتێکی ڕۆحییە.

هەروەها جوانی بەرلەوەی موڵکی شیعر بێت ڕۆحی دینە بۆیە کەسی دیندار یاخود ئیماندار چەندێك لەگەڵ جوانیدا مامەڵە بکات بەو ئەندازەیە لە ڕۆحی دینەوە نزیکە، واتە فەلسەفەی هونەر کە بریتیە "لە خوێندنەوەی شتەکان بە زمانی جوان و ناشیرین"

ڕۆحی دینە کە بەداخەوە ئەمڕۆ هونەر خراوەتە دەرەوەی بازنەی دین و دەرگای دینیان لێ داخستووە، کە ئەمە یەکێکە لە گەورەترین جەهل و غەفڵەتی مەعریفی، هەرچەندە ئەم دەرکردنەی هونەر لە بازنەی دین بە تەنیا بابەتێکی مەعریفی نییە، بەڵکو پراکتیککردنی جەوهەری دین لای هەر تاکێك و لای هەر کۆمەڵگەیەك وەستاوە لەسەر نزیکی ئەو تاکە یان ئەو کۆمەڵگەیە لە هونەرەوە "هەڵبەت هونەر بە واتا سوننەتی و ڕۆحیەکەی نەك بە واتا نوێ و مۆدێرنەکەی"، شەهرام گیان با لەوە زیاتر لانەدەین و بگەڕێینەوە سەر باسی جوانی شیعر.

ئەگەر چی شاعیر خاوەنی ئەو جوانییەیە کە لە شیعردایە، بەڵام جوانی شیعر وەك نیشتیمان وایە موڵکی هەموومانە، بۆیە لای ئەهلی شیعرو مانا تیاچوونی هەر دەستنووسێکی شیعریی شاعیرێکی جوان پەرست هیچی کەمتر نییە لە تیاچوونی بەشێك لە نیشتیمان، ئەگەر سەرگەردانترین و غەریبترین مرۆڤ ئەو کەسە بێت کە نیشتیمانێکی نییە ئەوا لەو غەریبتر و لەو سەرگەردانتر ئەو کەسەیە بە هێز و چێژی جوانی شیعر نەگەیشتووە، زۆرن ئەوانەی لە بری نیشتیمانێك چەند نیشتیمانێکیان هەیە، بەڵام هەر سەرگەردان و غەریبن کە ئەمە جگە لە دووری لە جوانی شیعر شتێکی تر نییە، بەڵام ئەو کەسەیش کە لەگەڵ جوانی شیعردا ئاشنا دەبێت ئیدی جێگەی ترس نییە، ئەم هێزەی جوانی شیعر خاڵی هاوبەشی نێوان هەرسێ کایەی "دین و شیعر و مۆسیقا"یە بۆیە داخستنی دەرگای مەعبەد و پەرستگایەك بە ڕووی عابیدێکدا

و دابڕینی کەسێکی ئەهلی جوانی شیعر لە شیعر و دوورخستنەوەی ڕۆحێکی مۆسیقی لە مۆسیقا هەمان کاریگەرییان هەیە لە ڕووی ڕۆحییەوە، واتە سەندنەوەی ئەم هێزانە لە مرۆڤ سەندنەوەی ڕۆحیەتی، هیچ کاتێکیش مرۆڤ بێ ڕۆح مرۆڤ نەبووە.

هەروەها جوانی شیعر بریتیە لەو داهێنانەی شاعیر دەیکات هەروەك چۆن داهێنانە شیعریەکانی شاعیر بریتیە لە جوانی شیعر، هەر شیعرێك خاڵی بێت لە داهێنان "زیاتر داهێنانی واتایی" ئەوا لە جوانیش خاڵییە، دواجار شیعر لادانی پەچەیە لەسەر ڕووی جوانی.

_ مامۆستا هەرچەندە من ئەزموونێکی زۆرم لە نووسینی شیعردا نییە، بەڵام ئەو کاتەی لە ئەشکەوتەکە ئەم شیعرانەم دەنووسی وام هەست دەکرد بە نووسینی ئەم شیعرانە خەریکم وێنەی ڕۆحی خۆم دەکێشم، واتە ئەوەندەی من لە شیعر حاڵی بووبێتم شیعر پەیامێکی ڕۆحییە نەك عەقڵی، ئایا وایە؟

+ شەهرام گیان وەکو خۆت وتت تۆ ئەزموونێکی کەمت هەیە لەگەڵ نووسینی شیعردا، بەڵام من ئەو ئەزموونەیشم نییە، ئەزموونی من لەگەڵ شیعردا زیاتر خوێندنەوەی شیعرە، بەڵام بە بەردەوامی و زۆر بە دیقەتەوە لەگەڵ خوێندنەوەی شیعردا ئەزموونم هەیە، من وای لێ تێدەگەم شیعر پێویستی بە ڕۆحە بۆیە شاعیر ڕۆحی خۆی دەدات بە شیعر، بەڵام پێویستبوونی شیعر بە ڕۆح چەندێکی بۆ خزمەتی شیعرە بە چەندین ئەوەندە بۆ خزمەتی ڕۆحە بۆیە "شیعر موحتاجێکی بەخشندەیە" هەر ئەو

موحتاجبوونەی شیعرە بە ڕۆح وا لە شاعیر دەکات هەموو ڕۆحی خۆی بە شیعر ببەخشێت، بۆیە هەرکەسێك، بەڵام بە مەرجێك شایەنی ئەوەی هەبێت دەتوانێت بە تەیکردنی شیعرەکانی شاعیر ڕۆحی شاعیرەکە ببینێت و دواجار ڕۆحی شاعیرەکە بناسێت.

هەروەها شاعیر دەربارەی هەرشتێك شیعر بنووسێت ئەوا ڕۆحی ئەو شتەی هێناوەتە ناو شیعرەوە بۆنمونە شاعیر کاتێك دەربارەی "زوڵف و قەد و بژە و ئەبرۆ و لەبی" مەعشوقەکەی خۆی دەنووسێت و باسیان لێوە دەکات ئەمە لە ڕاستیدا باسکردن نییە لەو شتانەی کە شاعیر ناویان دەبات، واتە کاتێك کە شاعیر دەڵێت "قەد یاخود لەب" مەبەستی لە باڵاو لێوی یارەکەی نییە، ئەم چەمکانە لە دنیای شیعردا و لای شاعیرەکان کۆمەڵێك چەمکی ڕەمزی و تەعبیرین واتە ئەم چەمکانە ڕەمزن بۆ شتێکی دیکەی جیهانێکی دیکە وە تەعبیر لەو شتەی جیهانەکەی دیکە دەکەن، کەواتە بەکارهێنانی ئەم چەمکە ڕەمزی و تەعبیریانە لەلایەن شاعیرەوە غەیری بیانو شتێکی تر نین واتە شاعیر ئەمانە دەکاتە بیانوی ڕۆح، بۆیە شاعیر هەرگیز باوەڕی بە بەکارهێنانی ناوێك و وشەیەك نییە کە ڕۆحێك لە پشتیەوە نەبێت.

ئەمەی کە وتمان دیوە ڕۆحیەکە و لایەنە ڕۆحیەکەی شیعر بوو کە بۆ شیعربوونی دەقێك بە تەنیا ئامادەبوونی ئەم لایەنە بەس نییە چونکە مەزنی پەیامە ڕۆحیەکەی شیعر نابێتە جێگرەوەی پەیامە عەقڵی و فیکریەکەی شیعر، هەروەها شیعر بە ئەندازەی خاڵیبوونی لە پەیامی عەقڵی لە شیعربوون دەکەوێت،

بەڵام دەبێت ئەوەشمان لەیاد بێت کە زۆری ئاماژە ڕۆحیەکان لە شیعردا بەڵگە نییە بۆ خاڵیبوونی ئەو شیعرە لە پەیامی عەقڵی و فیکری چونکە زمانی شیعر زمانی ڕۆح و خەیاڵە کە ئەم زمانی ڕۆح و خەیاڵە لە شیعردا ئەوەندە زاڵە زۆرجار شاعیر بە ڕۆح لە عەقڵیش دەدوێت کە ئەمە لایەنە ڕوخساریەکەی شیعرە ئەگەرنا لە ڕووی ناوەڕۆك و واتاوە شیعر ئەوەمان پێدەڵێت کە شاعیرە مەزنەکان بیرکەرەوەترین مرۆڤی سەرزەوین.

وە ئەو نەقسەی تووشی شیعرێك دەبێتەوە بەهۆی خاڵیبوونی ئەو دەقە لە عەقڵ و پەیامی عەقڵی هیچی کەمتر نییە لەو نەقسەی دەقێك بەهۆی نائامادەگی ڕۆح و خەیاڵ تووشی دەبێت، شیعر منداڵی دایك و باوکێکە دایکەکە ناوی خەیاڵە و باوکەکەیش ناوی عەقڵە جا بە ئەندازەی ڕۆحانیبوونی دایکەکە منداڵەکەش ڕۆحانی دەبێت هەروەك چۆن عەقڵانیبوونی باوکەکە دەبێتە مایەی عەقڵانیبوونی نەوەکەی، بەڵام نەمرترین و زیندووترین منداڵ ئەو منداڵەیە کە دایك و باوکەکەی بە قەدرەوە لە یەکتری دەڕوانن و هیچ کامێکیان بەبێ بایەخ سەیری قیمەتی ئەوی تریان ناکات.

_ مامۆستا شەوێکیان باسی خوێنەرو نووسەری زیندوومان کرد، مەبەستم ئەوەیە بۆت باسکردم کام خوێنەرە بە زیندوویی دەمێنێتەوە و کام نووسەرەش نەمر دەبێت و بە زیندوویی دەمێنێتەوە تەنانەت ئەوەشت ڕوونکردەوە کام دەقە نەمرە، واتە باستکرد کە دەقی وامان هەیە نووسەرەکەیشی وەفات دەکات،

بەڵام دەقەکە هەر زیندووە، ئەگەر لە شیعردا باسی ئەوە بکەین، چ شیعرێك نەمر و زیندووە؟

+ شیعر ئەبەدی و نەمر و جاویدان دەبێت ئەگەر بابەتە نەمر و ئەبەدیەکان تیایدا سەنتەر بن، بۆنمونە عیشق بابەتێکی نەمر و ئەزەلی و ئەبەدییە، بۆیە شیعری شاعیرە گەورەکان شیعری "حزوری" بوون نەك شیعری "حصولی" واتە شاعیرە گەورەکان کاتێك شتێك دەڵێن ئەوە خۆیان لەوێدا "واتە لە ناو ئەو شتەدا کە دەیڵێن" حزور و ئامادەگییان هەیە بۆنمونە کە دەربارەی عیشق قەسیدەیەك یاخود غەزەلێك دەنووسێت خۆی لە ناو عیشقدا ئامادەگی هەیە (خۆی عاشقە) ئەمە یەکێکە لەو فاکتەرانەی نەمری بە شیعر دەبەخشێت، کەواتە شاعیر نابێت شتێك بنووسێت کە پێشتر تەنها وەك مەعریفەیەك بەدەستی هێناوە "حاصلی" کردووە و دواتر بێت لە قاڵبی وەزن و قافیەدا دایبڕێژێتەوە، بەڵکو شاعیر دەبێت لە ئەنجامی مامەڵە و ئەزموونی ڕۆحییەوە شتێك وەربگرێت و دواتر بە شیعر بیداتەوە، شەهرام گیان بۆیە پێشتریش وتمان "شیعر پێویستی بە ڕۆحە".

بۆئەوەی شیعر نەمر بێت دەبێت شاعیر باوەڕی وابێت کە شیعر ئیشکردنە لەسەر لەقکردن و شکاندنی باوەڕی تەقلیدی، واتە ئەو شتانەی لە باوەڕی عادەتی و تەقلیدیدا بڤەن شیعر ئەوەندە شیعریانە لێی دەدوێت لە بڤەبوونی دەخات، بۆیە شوناسی شاعیر بریتیە لە نەهێشتنی بڤە، شاعیر تا ئەو شوێنە شاعیرە کە باوەڕی بە بڤە نییە، کە ئەم باوەڕ نەبوونە بە بڤە لە

ئەساسدا کاری پێغەمبەرانە، بۆنمونە دەستبردن بۆ بتەکان و قسەوتن بە بتەکان گەورەترین بڤەیە، بەلاَم پێغەمبەرێك دێت و هەموو بتەکان دەشکێنێت "مرۆڤ بەئەندازەی شکاندنی بتەکانی ناوەوە و دەرەوەی خۆی لە پێغەمبەرێتی نزیك دەبێتەوە" بەلاَم دەبێت شاعیر بە هەمان شێوەی پەیامبەران ئاگاداری ئەوە بێت کە لە ناوبردنی بتەکان و بڤەکان بە مەبەستی دروستکردنی بت و بڤەی دیکە نەبێت.

شیعر ئەگەر بۆ هەموان بێت نەمرێتی لە دەست دەدات، ئەگەر کەسێك ڕۆحییەن ئەهلی قورئان نەبێت ئەوا بە بیستنی ئایەتێکی قورئان قەلَس دەبێت، شیعریش دەبێت ئەهلی بیت ئەگەرنا بە هەمان شێوەیە، جا لەمەوە ئەوەمان بۆ کەشف دەبێت کە شیعر بۆ هەموان نییە وە کاری شاعیریش بریتی نییە لە ساناکردنەوەی شیعر بۆ ئەو ئاستەی کە هەموان لێی تێبگەن، بەلَکو کاری شاعیر لە نووسینی شیعردا بریتیە لە پێشکەشکردنی جوانی، بۆیە ئەگەر جوانی بریتی بوو لە سادەیی ئەوا با شیعر سادە بێت، بەلاَم ئەگەر جوانی شتێکی دیکە بوو ئەوا با شیعریش ئەو شتەی دیکە بێت "ئەرکی شاعیر نییە شیعر سادە بکاتەوە بۆ ئاستی خوێنەر، بەلَکو ئەوە خوێنەرە دەبێت خۆی بگەیەنێتە ئاستی تێگەیشتن".

هەروەها زۆرینەی جار ئەو بابەتانەی دەبنە بنەمای دەقە شیعریەکانی شیعرێکی نەمر و جاویدان بابەت گەلێکن لای مرۆڤەکانی دیکە حزوریان نییە و حساب بۆ نەکراون واتە ئەو بابەتانەن کە لای مرۆڤەکانی دیکە لە پەراوێزدان، بەلاَم شاعیر لە

خەیاڵی شیعری خۆیدا ئەوەی بۆ کەشف بووە کە ئەوەندەی پەراوێز حەقیقەتی تێدایە هەرگیز شوێنەکانی دیکە بەو جۆرە نین بۆ بوونی حەقیقەت، بۆنمونە لە ناو کۆمەڵگە دینییەکاندا ئەگەر سەرنج بدەینە دیندارەکان بە تایبەت دیندارە تەقلیدیەکان ئەوەی بە لایانەوە بریتیە لە حەقیقەتێکی گەورە "بەهەشت و دۆزەخ"ە ئیدی جگە لەم دوو شتە گشت شتەکانی دیکە خراونەتە پەراوێزەوە، بەڵام لای شاعیران بە تایبەت شاعیرە عارفەکان بەهۆی ئەزموونەوە ئەوەیان بۆ کەشف بووە کە حەقیقەتێکی دیکە هەیە زۆر جوانتر و مەزنترە وە زۆر لە سەروی حەقیقەتی بەهەشت و دۆزەخەوەیە ئەسڵەن ئەو حەقیقەتەی لای شاعیران ئەوەندە جوان و بە قودرەتە کە بە هۆی ئەوەوە حەقیقەتی بەهەشت و دۆزەخ بوونی هەیە، لێرەوەیە کە شاعیر ئەوەندەی حەقیقەتی پەراوێزخراوی لا جوانە هیچ کات حەقیقەتەکانی دیکەی ئەوەندە لا جوان نییە، تەنانەت لە ناو کتێبەکانیشدا نووسینێك بوونی هەیە پێی دەوترێت پەراوێز ئەگەر خوێنەر ئەو پەراوێزە پشتگوێ بخات و حساب بۆ ئەو پەراوێزە نەکات ئەگەری ئەوەی لێدەکرێت تێگەیشتن لە حەقیقەتی کتێبەکە بەدەست نەهێنێت. کەواتە نەمری شیعر وەستاوە لەسەر نەمری ئەو شتەی شیعرەکەی بۆ دەنووسرێت.

_ مامۆستا هەرچەندە من دوای دابڕانم لە کاریگەری ئەو گۆڕانە ڕۆحی و ناوەکیەی بەسەرمدا هات نەمتوانیوە تەنها شیعرێکیش بنووسم، بەڵام بە بەردەوامی هەست بە بوونی هێزێك یاخود شتێك

دەکەم کە کێشم دەکات بۆ خوێندنەوەی شیعر یاخود هەندێکجار بۆ نووسینی شیعر.

+ شەهرامَ گیان وەکو دەڵێن تازە تۆیش تووشی دەردەکە بوویت "دەردی بوونە ئەهلی شیعر" هەڵبەت ئەم دەردە هەم دەردیشە و هەم دەوایش، شاعیر و ئەهلی شیعر کاتێك دەگەنە قوڵایی شیعر شتێك دەبینن ئەگەر هەر مرۆڤێکی دیکە کە ئەهلی شیعریش نییە ئەو شتە ببینێت ئەوا هەرگیز بەبێ شیعر ناتوانێت بژی، ئەو شتەش بریتیە لە ئینسانیبوونی خۆی، ئەو ئینسانیبوونەی لە شیعرەوە دەست دەکەوێت ئەوەندە مەزن و زیندووە هیچ هێزێك دەرەقەتی مراندنی نایەت مەگەر تەنها هێزی دابڕان لە شیعر. بەڵام بوونە ئەهلی شیعر و خوێنەری شیعر کارێکی زۆر ساناتر نییە لە نووسینی شیعر، واتە "ئەرکی خوێنەری شیعر لە ڕووی سەختییەوە هیچی کەمتر نییە لە ئەرکی نووسەری شیعر!" چونکە شاعیر بۆ کێشانی هەر وێنەیەکی شیعری و خەلقکردنی هەر مانایەك تەجرەبەی تەریقەتێکی ڕۆحی کردووە ئەم تەجرەبەکردنی تەریقەتی ڕۆحییە سەختترین کارێکە وە هەر ئەمەیشە خوێنەربوونی شیعری کردووە بە کارێکی سەخت و گران، بۆیە لە ناو شیعریشدا لە ڕووی ماناوە بێماناترین شیعر ئەو شیعرەیە لەدایکبووی تەجرەبە و ئەزموونی ڕۆحی نییە. وە ئەگەر نووسینی دەقێکی شیعری بریتی بێت لە کێشانی وێنەیەك یاخود چەند وێنەیەکی شیعری کە وایە، ئەوا شاعیر هەرگیز باوەڕی بە کێشانی وێنەی ڕووکەشی نییە واتە شاعیر وێنەی بێ

ناوەڕۆك ناکێشێت کە ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی هەر خوێنەرێك خوێنەرێکی ڕووکەشی بێت نەتوانێت لە شیعر تێبگات.

دەبێت خوێنەری شیعر لەوە بەئاگا بێت ترس لە تێکدانی واقیع ترسێکە لای شاعیر بوونی نییە چونکە ئەرکی شاعیر لە شیعردا بریتیە لە جوانکردن نەك ئاسانکردن و ڕوونکردنەوە و گێڕانەوەی واقیع وەکو خۆی، ئەگەر شاعیر ئیش لەسەر شیکردنەوە و ڕوونکردنەوە بکات ئەوا زۆرجار جوانی ناخولقێت چونکە هیچ شتێك لە شیعردا ئەوەندەی ڕوونکردنەوە بکوژی جوانی نییە، کەواتە شیعر بەخشینەوە و پێدانی قەدرو قیمەت نییە بە شتەکان، بەڵکو شیعر بریتیە لە بە شیعری کردنی شتەکان کە زۆرجار لە بە شیعری کردنی شتەکاندا دەگونجێت بەهادارترین و بەنرخترین شت ببێتە بێ بەهاترین و بێ نرخترین شت "شیعر شتێك دەڵێت کە ناوترێت" ئەمە جوانی شیعرە.

ئەو ئاڵۆزی و ناڕوونییەی لە شیعردا بۆ خوێنەری شیعر دروست دەبێت بەلای شاعیرەوە هیچ گرنگ نییە، چونکە شاعیر شیعر بۆ ئەوە نانووسێت خوێنەرێك بیخوێنێتەوە و بە تەواوی لێی تێبگات، بەڵکو شاعیر شیعر دەنووسێت لەبەرئەوەی هێزی شیعر و جوانی شیعر ڕێگەی نادەن شیعر نەنووسێت "ئەگەر هێزی جوانی شیعر نەبوایە ئەوا شیعر نەدەنووسرا" بۆیە هەموو ئەوانەی شیعر بۆ ئەوە دەنووسن کە خوێنەر بیخوێنێتەوە ئەوا ئەو نووسینە شیعر نییە، شیعر ئەو شتەیە کە بۆ خوێنەر نانووسرێت، شیعر ئەو شتەیە بەهۆی هێزی جوانییەوە دەنووسرێت.

لەم کاتەدا نەمزانی بە هۆی چ کارێکەوە بوو مامۆستا بۆ ماوەی دە خولەکێك منی بە تەنها لە ژوورەکە جێهێشت، ئیتر منیش بە تەواوی لە دەوروبەری خۆم دابڕابووم و هەر بیرم لە قسەکانی مامۆستا دەکردەوە، لەبەرخۆمەوە دەموت شیعر نەبێت ژیان هیچ و نابووتە ژیان تەنیا بە شیعر جوان دەبێت، ئیدی مامۆستا گەڕایەوە و سەلامی کرد و دانیشتەوە منیش بەخێرهاتنی مامامۆستام کردەوە و وتم:

_ مامۆستا وات لێکردم ئیتر خەریکی هیچی تر نەبم، تەنیا شیعر بخوێنمەوە و هەوڵی شیعر نووسین بدەم.

+ شەهرام گیان، بەئازارترین و سەختترین دەردی مرۆڤ دەردی خۆنەناسینە، بەڵام شیعر یەکێکە لە هەرە ڕاستگۆترین یارمەتیدەرەکانی مرۆڤ بۆ تێگەیشتنی مرۆڤ لە خۆی واتە بۆ "خۆناسین" وە هەر دەوایەکیش. بۆ تیماری دەردی خۆنەناسین بەکاربهێنرێت چەنێك لە شیعر دوور بێت ئەوەندەش ئەگەری شیفادانی لاوازە چونکە یەکێك لە هۆکارەکانی خۆنەناسین بریتیە لە دوورکەوتنەوەی مرۆڤ لە جوانی جا هەر عیلاج و دەوایەکیش دوور بێت لە شیعر واتە دوورە لە جوانی، بۆیە ئەوە نەشتەرە نەك عیلاج، ئەگەر زانستەکان و کایەکانی دیکە مرۆڤ بۆ دەرەوەی خۆی دەبات ئەوا شیعر مرۆڤ ئاڕاستە دەکات بەرەو ناوەوەی خۆی، کایەکانی دیکە مرۆڤ بۆ ئەملا و ئەولا دەبەن واتە کایەکانی تر ئاسۆییانە مرۆڤ دەجوڵێنن، بەڵام شیعر مرۆڤ بۆ ناوەوەی خۆی قوڵ دەکاتەوە بۆ ئەوەی لەناکاو بۆ سەرەوە بەرز ببێتەوە واتە

**شیعر جوڵەی ستوونی بە مرۆڤ دەکات.**

شاعیر و ئەهلی شیعریش وەکو هەموو مرۆڤەکانی دیکە، بەڵکو زۆر لەوانیش زیاتر مەراق و دەرد و خەمیان هەیە کە هاوشێوەییەك لە نێوان خەمی ئەهلی شیعر و خەمی پەیامبەراندا بوونی هەیە ئەویش بریتیە لەوەی خەمی هەردووکیان خەمخواردنە بۆ هەموو مرۆڤایەتی نەك تەنیا بۆ خۆیان، بەڵام جیاوازی شاعیر و ئەهلی شیعر لەگەڵ مرۆڤەکانی تر ئەوەیە کە مرۆڤەکانی تر بەو خەمخواردنەی خۆیانەوە دەتلێنەوە، بەڵام شاعیر ئەو خەمەی کە بۆ هەموو مرۆڤایەتی هەیەتی دەیکات بە شیعر ئەم بە شیعریکردنە لای شاعیر و ئەهلی شیعر باشترین دەوایە. بەڵام بۆ نووسینی شیعر دەبێت ئاگاداری یەکێك لە هەرە تایبەتمەندیەکانی نووسینی شیعر بین ئەویش "ئازادی"یە (هەر جەستەیەك خۆراکی لێ مەنع بکەیت ئەوا پاش چەند ڕۆژێك ئەو جەستەیە لەناودەچێت و فەوت دەکات) نووسینیش بە تایبەت نووسینی شیعر ئەگەر ئازادی لێ زەوت بکەیت نەك فەوت دەکات، بەڵکو هەر لەدایك نابێت و نایەتە دنیاوە تا فەوت بکات، هەڵبەت شەهرام گیان مەبەستمان لە ئازادی ئەوە نییە شاعیر لە ڕووی جەستەییەوە ئازاد بێت ئەسڵەن شاعیرە مەزنەکان و شاعیرە ڕۆحانییەکان "شاعیرە عارفەکان" تەریقەتی زیندانیکردنی جەستەیان ئەزموون کردووە بۆیە هەندێکجار نەك هەر شیعر، بەڵکو شاکاری ئەدەبیشیان تۆمار کردووە، شاعیرە مەزنە مەعنەویەتگەراکان لەبەر ئازادکردنی دڵ و ڕۆح و فیکری خۆیان

چەندین ساڵ جەستەیان تەسلیم بە زیندان کردووە تەنانەت شاعیری وا هەبووە بۆئەوەی قبوڵی نەکات ئازادی ڕۆحی و فیکری لێ بسێننەوە قبوڵی کردووە بیکەن بە داردا و بەردەبارانی بکەن، بۆیە ئەو ئازادیەی بۆ نووسین پێویستمانە ئازادییەکی ناوەکییە نەك دەرەکی.

وە نزیکییەك و هاوشێوەییەکی زۆر هەیە لە نێوان شیعر و کتێبە ئاسمانییەکاندا لە ڕووی جێهێشتنی کاریگەری لەسەر مرۆڤەکان "هەڵبەت شەهرام گیان بە ڕەچاوکردنی ئەوەی کە شیعر مرۆڤ دەینووسێت، بەڵام کتێبە ئاسمانییەکان هی خالقی مرۆڤە" واتە ئەو مەعریفەیەی لەناو دەقێکی شیعریدا بوونی هەیە ئەگەر هەمان مەعریفە لەناو یەکێکی دیکە لە کایەکاندا بوونی هەبێت ئەوەندەی مەعریفەی ناو دەقە شیعریەکە جوان و کاریگەر نییە، بۆنمونە شاعیرێك و نووسەرێکی ناو یەکێك لە کایەکانی دیکەی جگە لە شیعر دەیانەوێت هەمان مەعریفە بگەیەنن، بەڵام کاتێك ئەم مەعریفەیە دەگات بە خوێنەر ئەوا ئەوەی ناو کایە شیعریەکە کاریگەری جوانتر لەسەر خوێنەرەکە دروست دەکات چونکە شاعیر ڕۆحی خۆی کردووە بە کاڵا بۆ باڵای مەعریفەکەی بۆیە ئەو مەعریفەیەی لە شاعیرەوە دەردەچێت گەرموگوڕترە و زیاتر خوێنەر جۆش دەدات وە زیاتر جوڵەی ڕۆحی و ئەخلاقی بە خوێنەر دەکات، لێرەوەیە نیشانەی بوون بە ئەهلی شیعر و ئەدەب بریتیە لە جموجوڵە ئەخلاقیەکان وە شیعر لە هەرجێیەك دژی ئەخلاق بێتەوە شیعربوونی خۆی لەدەست دەدات، ئەمە لە هەمان

کاتدا نیشانەی عاشق بوونیشە، واتە "هەرگیز عاشق نییە ئەو مرۆڤەی مامەڵەی نائەخلاقی دەکات" هەروەها بە تێڕامان لە شاعیر و ئەدیبەکان و ئەهلی ئەدەب دەتوانین کەشفی ئەوە بکەین کە گەرموگوڕترین مەعریفە بریتیە لە مەعریفەی ئەدەبی و شیعری هەر بۆیە چەمکی سووتان هی شاعیرەکان و عاشقەکانە نەك هی کەسی دیکە، وە ئەم گەرموگوڕییەیە مەعریفەی شیعری لە مەعریفەی کایەکانی دیکە جودا دەکاتەوە، هەروەها ئەم جیاوازیە لە نێوان مەعریفەی پێغەمبەران و مەعریفەی پیاوە ئاینییەکانی ئەمڕۆشدا دەبینرێت واتە ئەو مەعریفەیەی پێغەمبەر دەیدا بە مرۆڤایەتی هەمان ئەو مەعریفەیە کە ئەمڕۆ لای زۆرینەی مامۆستا ئاینییەکانمان بوونی هەیە، بەڵام پێغەمبەر خۆی بوو بە مۆم و سووتا بۆیە ئەو هەمووە پەروانەیە لە دەوری کۆبوونەوە و ئەوانیش سووتان، بۆیە ئەمڕۆ لە هەر جێیەك مامۆستایەکی موحەمەدئاسا بوونی هەبێت ئەوا لەو جێیە بیلال و موصعەب و ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و عائیشە و ئەسماو، ئەوانە هەموویان بوونیان هەیە. هەروەها شاعیر و پەیامبەر لەو خاڵەشدا تەواو لە یەك دەچن کە پەیامبەرێك ئەو کاتەی وەحی بۆ دێت ئیدی ناتوانێت نەیڵێت و لێی بێدەنگ بێت، بەڵام خۆ تا ئەو کاتەیش کە وەحی بۆ نەهاتووە هەرچییەکیش بڵێت بریتی نییە لە وەحی، شاعیریش وەهایە کە ئیلهامی بۆ هات ناتوانێت بێدەنگ بێت، بەڵام غەیری ئیلهام هەرچییەکی دیکە بڵێت نابێتە شیعر.

شەهرام گیان لەگەڵ هەموو ئەوانەی کە وتمان و لەگەڵ

هەموو ئەو سەرنج و ڕەخنانەی لە شیعر دەگیرێت، من وای لێ حاڵی بووم بۆ شیعر ئەوەندە بەسە کە تەریقەتی پەیوەندیکردنی مرۆڤی بە خواوە ڕاست کردەوە، بۆ شیعر ئەوەندە بەسە مرۆڤی لەگەڵ جوانیدا ئاشت کردەوە، بۆ شیعر ئەوەندە بەسە کە وتی چوونە حزور و بەردەم خودا بۆ تێگەیشتن لە خودا نییە، بەڵکو بۆ تێڕامانە لە خودا.

وە شتێکیش شایەنی لەیاد نەکردنە ئەوەیە کە شاعیر ناوی وەکو شاعیر دەمێنێتەوە ئەگەر لە شیعریش هاتە دەرەوە هەر شاعیر بێت واتە ئەو ڕۆحیەتەی لە کاتی مامەڵەکردن لەگەڵ شیعردا "نووسینی شیعر" هەیەتی نەگۆڕێت و نەشێوێت و پێچەوانە نەبێتەوە لەگەڵ ئەو ڕۆحیەتەی دوای هاتنەدەرەوەی لە شیعر، واتە بۆئەوەی شاعیرێك تا ئەبەد بە شاعیری بمێنێتەوە مەرج نییە تائەبەد شیعر بنووسێت، بەڵکو ئەوە گرنگ و گەورەییە بۆ شاعیر کە ئەگەر لە نووسینی شیعریش هاتە دەرەوە یاخود لە نووسینی شیعر دابڕێنرا هەڵوێستی پێچەوانە نەبێتەوە، شاعیربوون درێژەدان نییە بە نووسین و تۆمارکردنی دەقی شیعری، بەڵکو شاعیربوون ئەوەیە پەیامە ئاسایی و سادەکانی شاعیر دژ نەیەنەوە لەگەڵ پەیامە شیعریەکانیدا، واتە ئەو مرۆڤە هەرگیز ناکرێت پێی بوترێت شاعیر کە لە ئان و ساتی نووسینی شیعردا دەبێتە پەپولە و فریشتە، بەڵام لە دەرەوەی شیعر دەبێتە شەیتانێکی ڕاستەقینە.

دوای چەند شەوێك لەو شەوەی لە ماڵ ماموٚستا ئەکرەم بووم و ماموٚستا باسی شیعری بوٚ کردم، نوٚرەی من هاتەوە بوٚ پاسەوانی کردنی مەخزەنەکەی ماڵی غەزالی، ئیتر ئەوە بوو بەر لە ئێوارە خوٚم گەیاندە مەخزەنەکە، بەڵام لەسەر لێواری پەنجەرەی ژوورەکە زەرفی نامەی لێ نەبوو، پاش ئەنجامدانی نوێژی ئێوارە و نەختێك دانیشتن دەستمکرد بە خوێندنەوەی ئەو دیوانە شیعریەی کە چەند ڕوٚژێك پێشتر کڕیبووم "هەڵبەت زیاتر بە هوٚی قسەکانی ئەو شەوەی ماموٚستا دەربارەی شیعر بڕیارمدا ئەو دیوانە بکڕم" چەند شیعرێکم لێ خوێندەوە و پاشان لە دوای چەند خولەکێکی دیکە لە دانیشتن و بیرکردنەوە لە شیعر دەستمکرد بە خوێندنەوی ئەو بەشەی کە دامنابوو ئەمشەو تەواوی بکەم لەو کتێبەی باسی مەرگی دەکرد، ئیتر ئەو شەوە ئەو کتێبەم تەواو کرد و هەستام نوێژی خەوتنانم ئەنجامدا و دواتر نووستم، بەڵام نووستنی چی؟ کاتژمێر دووی شەو دەنگێکی نزمی گریان و هاواری چەند

ئافرەتێك بە خەبەریان هێنام کە هەستام دەرگای ژوورەکەم کردەوە دەنگەکە زیاتر بوو، نەختێك گوێم ڕاگرت بۆ ئەوەی بزانم ئەم گریانە بۆچییە، لەناو گریان و هاواری ئافرەتەکاندا دەنگی ئافرەتێك زیاتر دەبیسترا کە دەیوت "باخان گیان هەناسەکەی دایە... باخان گیان چاوەکانت بکەرەوە" ئیتر وردە وردە گەڕەك پڕبوو لە ورتە ورت و دەنگە دەنگ، لەم کاتەدا پیاوێك وتی "کچە شووکردووەکەی کاك محەمەدە لە کاتی منداڵبووندا مردووە!" تەزوویەك هات بە گیانمدا و بەرچاوم ڕەش بوو بۆیە بە پەلە دەستم نا بە دیوارەکەوە و لەبەرخۆمەوە وتم "إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ " بەخێرایی دەرگای ژوورەکەم داخست و ڕامکرد بەرەو کۆڵانی ئەودیو بۆ ماڵی غەزالی کاتێك گەیشتمە سەرسوچی کۆڵانەکە بینیم بەردەرگای ماڵی غەزالی تەواو قەرەباڵغە ئیتر هێواش هێواش بە هەناسەیەکی هەنسکاوی و چاوی فرمێسکاوییەوە بەرەو قەرەباڵغیەکە چووم، خۆم نزیك کردەوە لەو شوێنەی کە زۆربەی خەڵکەکە تەماشایان دەکرد بینیم وا مامۆستا ئەکرەم و غەزالی یەکتریان لە ئامێز گرتووە و گریان و موحیببەتیان جارێکی تر تێکەڵ بەیەك کردووە چوومە تەنیشتیانەوە و پاش کەمێك کە مامۆستا چاوی بە من کەوت بەدەم وتنی "شەهرامەکەم، شەهرامەکەم"ەوە باوەشی پیا کردم و بە توندی لە ئامێزی گرتم، بەڵام لەو کاتەدا بە نیسبەت پیاوانەوە چاوەکان قسەیان دەکرد

چونكە زمان لە وتن كەوتبوو وە جوانترين قسە لەو ساتەدا بريتى بوو لە فرمێسك هيچ شتێك نەبوو بتوانێت شوێنى دڵۆپێك فرمێسك بگرێتەوە.

بۆ بەيانى كە ڕۆژ بوويەوە تەرمەكەى دادە باخان بەرەو گۆڕستان بەڕێخرا، بەڵام بەرەو گۆڕستانى ئەو لادێيەى مامۆستا ئەكرەم بۆ چەندين ساڵ لێى مامۆستا بوو "چونكە هەم مامۆستا وە هەم دادە باخانيش پێشتر لاى يەكتر وەسێتيان كردبوو ئەگەر مردن لەوێ بنێژرێن" هەرچەندە لەناو خەڵكەكەدا ورتە ورتى ئەوە دەهات كە چۆن شتى وا دەبێت، بەڵام مامۆستا بەو حاڵەيشيەوە كە هەيبوو سوور بوو لەسەر بەجێگەياندنى ئەو وەعد و وەسێتەى لە نێوان خۆيو دادە باخاندا هەبوو.

پاش سێ ڕۆژى پرسەكە، كە من و غەزالى و مامۆستا لەو سێ ڕۆژەدا بەردەوام پێكەوە بووين چونكە تەنها پێكەوەبوونمان دەيتوانى بەشێكى كەم لەو دەردە دەوا بكات، ئيتر مامۆستا ئەكرەم ديارنەما كە ئەمە بە تەواوى ماڵى غەزالى بە تايبەت غەزالى خۆى زۆر شپرزە كرد، بەڵام وەكو ئەوەى شتێك من بە خۆيەوە مەشغوڵ بكات زۆر بيرم لە ديارنەمانى مامۆستا نەدەكردەوە! تا ئەوەى نزيكەى چەند ڕۆژێك بەسەر ديارنەمانى مامۆستادا تێپەڕى كرد ئيتر هێواش هێواش بێمانايى ژيان لاى من دەستى پێكرد "ژيان بەبێ مامۆستا ئەكرەم بۆ من هيچ مانايەكى نەبوو" هەموو ئەو فەراغە ڕۆحيانەى پێشتر بە هۆى بينينى مامۆستاوە پڕ

دەبوونەوە بە دیارنەمانی مامۆستا دروست بوونەوە تا ئەوەی جۆرێك لە شێتی لە ناخی مندا دروست بووبوو، نەمدەزانی بۆچی دەژیم، لە ڕاستیدا بە دیارنەمانی مامۆستا ڕێگەی چوونە حزوری خواشم وردە وردە لێ دیار نەما، مامۆستا نووری چاوانی من بوو کە نوور نەما ئیدی ناتوانی شتەکانی دیکەش ببینیت، ئای ژیان لە بێ مامۆستاییدا چەندە هیچە.

ڕۆژێکیان دەنگێك یاخود هەستێك پێی دەوتم بڕۆ بۆ سەردانی گۆڕەکەی دادە باخان، ئەم دەنگە یاخود ئەم هەستە چەند جارێك ئاگاداری کردمەوە، بۆیە بڕیارمدا پاش نیوەڕۆ بەرەو گۆڕستانی لادێکە بەڕێکەوم، ئەوە بوو پاش عەسر گەیشتمە سەر گۆڕەکەی دادە باخان نزیکەی کاتژمێرێك بە بیرکردنەوە و قسەکردن لەگەڵ ڕۆحی دادە باخاندا مامەوە، هەرچەندە بە نیازی چوون بۆ ئەشکەوت نەهاتبووم، بەڵام بەهۆی درەنگی کاتەوە بڕیاری نەگەڕانەوە و چوونە ئەشکەوتم دا، لەسەر گۆڕەکە هەستامەوە بە نیازی چوون بەرەو ئەشکەوت پاش بڕینی بەشێك لە ڕێگەکە خۆم گەیاندە کانییەکەی نزیك ئەشکەوتەکە و نەختێك خۆم فێنك کردەوە بینیم لەلای کانییەکەوە عەلاگەیەك دانراوە چەند دانەیەك مزرە سێو و دوو تەماتە و یەك پارچە نانی ڕەقی تێدایە نەویم لە عەلاگەکە و سەرکەوتم بەرەو ئەشکەوتەکە کاتێك گەیشتمە ناو ئەشکەوتەکە بینیم وا کەسێك کە پشتی لە من بوو بە شێوەی ئەنجامدانی عیبادەت دانیشتووە و پارچە پەڕۆیەك لەسەر

هەردوو شانەکەیەوە بە پشتیدا هاتبوویە خوارەوە، منیش ترسێکم لێ نیشت، بەڵام هەوڵم دەدا ترسەکەم بشارمەوە، ئیتر بۆ ئاگادارکردنەوەی ئەو کەسە وتم "یاالله" بەڵام ئەو هیچ جوڵەی نەکرد و لای نەکردەوە بەلای مندا بۆیە منیش لەوە زیاتر دەنگم نەکرد و هەر بە بێدەنگی لە لایەکی دەروازەی ئەشکەوتەکەوە دانیشتم، پاش نزیکەی بیست خولەك دەنگێك لای کەسەکەوە هات وتی "فەرموو براکەم" کاتێك سەرم هەڵبڕی باوەڕم بە چاوەکانی خۆم نەدەکرد، چاوەکانم پێیان دەوتم شەهرام خۆ ئەوە مامۆستا ئەکرەمە، زۆر بە خێرایی هەستام چووم بەرەو لای مامۆستاو توند توند یەکتریمان لە ئامێز گرت من دەموت "مامۆستاکەم" مامۆستاش هەر دەیوت "شەهرامەکەی مامۆستا"، خۆشییەك هەموو گیانمی گەرم کردبوو، تا چەند خولەکێك هەر بە بێدەنگی من لە مامۆستا و مامۆستایش لە من ڕامابووین بێ ئەوەی هیچ کامێکمان وشەیەك بڵێین، دوای تێپەڕینی ئەو ماوە بە بێدەنگی، من پرسیم:

_ مامۆستا لێرە چی دەکەیت؟

+ شەهرام گیان درەنگ هاتمە ئەم ئەشکەوتە، دەبوو زووتر بهاتمایە بۆ ئێرە. مامۆستای من عیشقە هەرکەسێکیش عیشق مامۆستای بێت ناتوانێت بە گوێی نەکات، زۆر دەمێکە ئەم مامۆستایە هاوارم لێدەکات بڕۆ، ئەوەتا دواجار بە گوێم کرد و هاتم.

_ مەبەستت چییە لەوەی درەنگ هاتی بۆ ئێرە؟

+ لەو کاتەوەی باخانی ڕەحمەتی بوو بە خێزانم ئیدی کەسێکی دیکەم ئیهمال کرد و وازم لێ هێنا.

_ مامۆستا ئەو کەسە کێ بوو؟

+ ئەو کەسە خۆمم، گەورەترین هەڵە و گوناهی مرۆڤ ئەوەیە خۆی واز لێ بێنێت، بۆیە مرۆڤ هەمیشە پێویستی بە تەنیایی هەیە، ڕاستە بە پێکهێنانی ژیانی خێزانیم لەگەڵ باخانی ڕەحمەتیدا چەندین شتم بۆ کەشف بوو کە ئەو شتانە تەنها بەهۆی ژیانی خێزانییەوە بۆ مرۆڤ کەشف دەبن، بەڵام هێواش هێواش گەورەترین شتم لەدەست دەچوو ئەویش خۆناسین بوو، هەر بۆیە لە ئێستادا بۆ ماوەیەکی دیارینەکراو بڕیاری هەڵبژاردنی تەنیایم داوە.

بەڵێ... ئیدی لەو ساتەوە من و مامۆستا ئەکرەم پێکەوە لە تەنیاییدا دەژیاین تا ئەو ساتەی ویست و ئەمری خودا هات و فەرمووی دەبێت لە یەکتر دابڕێن.

"دابڕان ئەو حەقیقەتەیە ئێمە هەرگیز ناتوانین لێی دابڕێین"